

سپیرێز


خودانێ ئیمتیازێ
حافظ قاضێ

سەرنڤیسەر
مؤید طیب







ئەدرێس

کوردستانا عیراقێ - دهۆك
ناڤهیێ ئێکەتیا سەندیکایێن
کرێکارێن کوردستانێ
قاتێ سێیەم
تەلەفۆن: ٧٢٢٥٣٧٦ - ٧٢٢٢١٢٥

www.spirez.org
www.spirezpage.net



دار سبيريز للطباعة والنشر
دهوك

- **ژمارا وەشانێ:** (٣٠٦)
- **ناڤێ پەرتووکێ: دیوانا وەداعی**
- **بەرهەڤکرن: سەعید دێرەشی**
- **دەرهینانا ناڤەرۆکی: ئەلند ئازاد**
- **بەرگ:** بەیار جەمیل
- **سەرپەرشتیێ چاپێ:** شێروان ئەحمەد تەیب
- **چاپا: ئێکێ**
- **تیراژ:** (٧٥٠) دانە
- **ژمارا سپارتنێ ل پەرتوکخانا بەدرخانییان ل دهوك (٤٥٧) ل سالا ٢٠٠٨**
- **چاپخانا حەجی هاشم- هەولێر**

SPIREZ PRESS & PUBLISHER
DUHOK

# بیرێست

# بەراهی
# بۆ چاپێ دوێ

رۆژا ٣١/ ٧/ ٢٠٠٠ێ ل "شتاتبیبلیۆتێك"ا بەرلینێ ئەز بسەر دەسنڤیسا دیوانا وەداعی هەلبووم. رۆژا ٢٠/٦/ ٢٠٠١ێ تویژاندنا دیوانێ بدویماهی هات. سالا ٢٠٠٢ێ چاپا ئێکێ ل وەشانخانا ناڤەندا هاڤیبوون یا لێکۆلین و وەشانێت کوردی ل بەرلینێ دەرکەڤت.

هەر وێ سالا کو دیوان پێ دەرکەڤتی، من گەلەك پێکۆل کر ل کوردستانێ چاپ بکەم، لێ مخابن پێکۆلێت من هەمی ب ئاڤێدا چوون، چ دەزگەهێت بەلاڤکرنێ ملێت خۆ نەدانە بەر..

نهۆ پشتی دەزگەها سپیرێز خۆ دبەر چاپکرنا وێرا بری، دیسا سەر ژنوی من دیوان تویژاندەڤە، گەلەك خەلەتی هاتنە راسڤەکرن، شعرێت وی یێت نە بەلاڤبوویی ژێ هاتن زێدە کرن، دەسنڤیسا دیوانێ هاتە نیشادان و ب ئاوایەکێ خشکۆکتر هاتە ئاڤاکرن.

د کتێبا "کەلهێن ئاڤا"دا، من هندەك پێزانینێت نوی و دو هەلبەستێت وی یێت کو ددیوانێدا نینن، تێدا بەلاڤ کربوون، ئەوان، هەروەکی د کتێبا ناڤبریدا هاتین، ل ڤێرێ ژی بەلاڤدکەین.

د کەلهێن ئاڤادا مە گۆتبوو:

((جارا ئێکێ دەمێ مرۆڤ تشتەکی چاپ دکەت، پشتی هنگی ب دەمەکی سەردا دچیت و دیسان دخوینیت، گەلەك هزرێت نوی و کێم و کاسی و تشتێت نوی تێنە مەیدانێ، وەداعی ژی وەکی شاعرەکێ ژێهاتی و خودان شیان، خویایە کو قەلافەتا وی ژ ڤێ مەزنترە یا مە ددیوانێدا دایە پێش چاڤ، ژبەر وێ چەندێ ژی دوور نینە رۆژ بۆ رۆژێ تشتێ وی یێ نوی خویا ببیت و پتر رۆناهی بکەڤیتە سەر ژینا وی.

مه ددیونێدا {چاپا ئێك} نه گوتبوو کا کەنگی و کێ دەسنڤیسا دیوانا وەداعی ژ کوردستانێ ئینایە؟ ل پەی وان پێزانینێت من ل بیبلیوتێکێ وەرگرتین, دەسنڤیسا وەداعی, د ناڤبەرا سالێت ١٩٠٥-١٩٠٧ ئارشێئولوگ [١] (LeCoq) ژ کوردستانێ ئینایە و فرۆتییە پەرتووکخانێ. ئو د سالا ١٩٠٨ێدا بیبلیوتێکێ دەسنڤیس ئارشیف کرییە و د رێزا دەسنڤیسێت کوردیدا دانایە.

دیسان هەژییە بێژم: کو د. کەمال فوئاد سالا ١٩٧٠ بیبلوگرافیەك ل سەر دەسنڤیسێت کوردی یێت بەرلینێ دانایە, ل سەر هەر دەسنڤیسەکێ کورتیەك نڤسییە و میناکەك ژ بەراهیێ و دوماهیێ ئینایە, ئەڤ کارێ وی یێ بەرکەفتی نامەیا وی یا دکتوریێ یە. دەسنڤیسێت کوردی تنێ ب رێیا ڤێ بیبلوگرافیێ تێن دیتن.

د. کەمال فوئاد د راستا دەسنڤیسا وەداعیدا ب ئەلمانی هۆسا د نڤیسیت: (١٩٠٨. ١٢٥. کاغەزەکا گەورا رەق. دلۆپێت ئاڤێ گەلەك پنی ئێخستینێ, چاررەخێت پەڕا دڕیاینە, دیارە پەڕەکێ کێمە. د ناڤبەرا بەرپەڕێ ٣٨ و ٣٩, وەکو دی جوان یا هاتیە پاراستن. ٤١ پەرە. ١١,٥ × ١٦,٥سم. ٩,٥ × ١٤,٥سم ب خەتەکێ نەستەلیقێ رەش و جوان, سەر و بن و بەروار هاتیە نڤیسین.) [٢]

پشتی ڤان رێزان, هەر د کتێبا ناڤبریدا من ئاور دایە وان دو هەلبەستێت وەداعی یێت کو ددیوانێدا نەهاتینە:

١- هەلبەستەك ل سەر میری, ل بەرپەڕێ داویێ د دەسنڤیسێدا, نە دهات خواندن. ژ بەر وێ چەندێ مە ددیوانێدا {چاپێ ئێکێ} نە وەشاندبوو. لێ

---

[١] {August} Le Coq. Albert (٨. ٩. ١٨٦٠)یێ ل باژێڕێ بەرلینێ هاتیە دنیایێ, ٢١. ٤. ١٩٣٠یێ مری یە. سالا ١٩٢٥یێ رێڤەبەرێ موزێیوما Völkerkunde ل بەرلینێ بوویە. د سالێت ١٩٠٤-٥. ١٩٠٥-٧ و ١٩١٣-١٤ سەرڤەگێڕیا شاندەکا هونەری و دیرۆکا باژێڕڤانی یا ئاسیا ناڤین کری یە. د ڤێ گەڕیانا خودا بۆ ئاسیا ناڤین, وی گەلەك بەرکارێت ب نرخ نڤیسین, ژ وانا, سالا ١٩٢٢-٣٣ د گەل E Waldschmidt ئەتلەسەکا شکلان, کو حەفت جلدە, ل سەر دیرۆکا هنەری و کولتوری ل ئاسیا ناڤین نڤیسی یە..

[٢] KURDISCHE HANDSCHRIFTEN, Beschreben von KAMAL FUAD, 1970 Berlin, Bl.1

پشتی من لبا رەسەن (اصلی) ل پەرتوکخانا بەرلینێ خووندییەڤە, ئەز شیام وێ هەلبەستێ ژ دەسنڤیسێ راکەم و د ڤێرێدا دانم.

٢- دەسنڤیسەکا کتێبا یوسف و زولەیخا یا شاعرێ مەزن "سەلیمی" گەهشتیە دەستێ من, کو سالا ١٩٧١ێ ب دەستێ هێژا مەلا سالەح بارزانی هاتیە مەشقکرن, د دیباجا وێدا, ناڤێ وەک (فەسلەک) زێدە هاتییە و د داویا ناڤێرێدا, ناڤێ وەداعی هاتییە, دبێژیت:

**ناچاری وەداعی کر تەمامێ**

**تەحریر مە کر ژ بۆ وێ نامێ**

## چەند خالێت گرنگ هەنە, من دڤێت دڤێ پێشگۆتنێدا ئاوڕێ بدەمێ:

*. دچاپا ئێکێدا من گۆتبوو: هەلبەستێت کوردی و فارسی د دەسنڤیسێدا ژێك نە هاتینە جوداکرن.. ئەڤجا مە ژی ل پەی ڕێزکرنا مەشقڤانی هەلبەست ڕێزکرینە. لێ ئەڤ ڕێزکرنا شعرێت کوردی و فارسی ئێك ل دویڤ ئێکێ هەروەك مەشقڤانی نڤیسی, ددەمێ چاپکرنێدا ژبەرێك چوبوون و ڕێزا وان هاتبوو هەلوەشاندن, لەوڕا ژی د چاپا دوێدا دیسا من سەراستکرن.

*. ددەسنڤیسێدا, ل سەرێ هەر شعرەکێ نڤیسییە "ولە". ئو ئەگەر شعر چووبیتە بەرپەڕێ دی, دیسا لسەرێ ڕێزا ئێکێ نڤیسییە "منە".

*. گەلەك خەلەتییێت بچویك ل سەر مندا بووریبوون ئان من نە دیتبوون, ئەو هەمی هاتنە راستڤەکرن.

*. شعرێت دیوانێ یێت کوردی و فارسی هەمی پەیڤ پەیڤ, دگەل دەسنڤیسێ هاتن هەڤبەرکرن.

*. وەداعی د ئەزمانێ خۆدا "ڤێ" شوینا "وێ" خەبتاندییە, بۆ میناك:

((عومرێ من "ڤێ" ئنتها بوو، بوویە نێزیك پەنجهان))

((ئـەی دلـۆ "ڤێ" هـاتِ پـیـری))

(( من گونەه "ڤێ" تـێـنـە بـیری))

((د گەل "ڤێ" رابوارین پڕ جەفایە))

((من ژدل و چەهڤان خوون "ڤێ" د باری))

**((جەمالا تە ل من "ڤیٚ" بوویە حەسرەت))**

*. ناڤیٚ دیوانا وەداعی ب ڤی رەنگی هاتیە دانان:

**((هو المستعان وعلیە التكلان**

**دیوان وداعی رحمە الله))**

*. ددەینڤیسیٚدا ناڤنیشان بوٚ شعرا نە هاتینە دانان, تنیٚ د هندەك شعرادا ئەگەرا پیٚڤەهاندنا شعریٚ هاتیە نڤیسین, وەكی: ((مخمس {٧})), ((ولە بترتیب حروف الهجئ {٢٥})), ((در ثنای باری تعالی وآمدن باران در ماە كانون اول سـنە ١٢٣٩ {٢٧})), ((در مرثیەء شیخی بیك حاكم مكس {٢٩})). ل دویماهیا هوٚزانا نمرە {٣٥} ژی وەداعی ئەڤ نیٚرینا هەنیٚ نڤیسییە:

((تمت نمودە دران روزها كە خان محمود توجە بارضروم نزد حافظ شا برد. اللهم اجعل التوفیق رفیقە واعنە واحفطە. سنە ١٢٥٦ هـ))

ژبەر ڤیٚ چەندیٚ ژی من هەما هەر شعرەكیٚ لدویڤ ریٚزكرنا دەسنڤیسیٚ هژمارەك بوٚ دانایە. من نەدیت پیٚدڤی ویٚریٚ, كو ناڤنیشانا بوٚ دانم.

ئەڤە بوٚ شعریٚت كوردی, ئو بیٚت فارسی, ئەو ژی هەر وەكی بیٚت كوردی, تنیٚ هندەك جارا ئەگەریٚ ڤەهاندنا شعریٚ هاتیە دیاركرن.

*. د بەرپەریٚ (٧٧)دا ژ دەسنڤیسا دیوانا وەداعی بەرپەرەك هاتییە, چەند نڤیسینیٚت كورت تیٚدا هاتینە:

١. فی بیان الغالب والمغلوب

**طاق كم بر طاق پش و جفت كم بر جفت پش**

**طاق بر جفتی كم از وی جفت هم بر طاق كم**

**غالبـت ای خواجە چون دو نـام كرای حسنا**

**طرح كردی نـە و نە و نە مانە نە پش و نە كم**

**طـاق بـە طـاقــی روی طـالــب بـود غـالــب**

**جــفــت جــفــت روی مــطــلــوب ای اكـــرم**

٢. ابـجـد (١, ٢, ٣, ٤): اى مـنـع آدم مـن طـاعـتـه
هوز (٥, ٦, ٧): اى ينزل من السماء الى الأرض
حـطـى (٨, ٩, ١٠): اى حـط ذنـبـه بـتـوبـتـه
كلمن (٢٠, ٣٠, ٤٠, ٥٠): اى اكل من الشجرة
سعفص (٦٠, ٧٠, ٨٠, ٩٠): اى اعطى آدم ربّه الجنّة بالنّعم
قرشـت (١٠٠, ٢٠٠, ٣٠٠, ٤٠٠): اى اقـرّ واعتـرف بذنبـه
ثـخـذ (٥٠٠, ٦٠٠, ٧٠٠): اى امـن بـالـمـغـفـرة
ضظغ (٨٠٠, ٩٠٠, ١٠٠٠): اى سلّم من العقوبة

٣. (لاجل مـخـدومـيـم نوشتـه شده)
بـمــخـدومــى كه نور چشم ماها
دُرِ يــكــتـــا شـهـــاب الـدّيـن طه
مـكـمّـــل مـــرشـدِ آن پـيـــر رهبر
نـكنجد شرح وصفش درج دفتـر
كرامى داشت سه (٣) فرزند مـولود
علاء الـديـن عـبـيـد الله مـحـمود
بـــود هـــريـــك نـــهـــالــى بر كزيده
زســتـــانــى لـطـــافـت آفـــريـــده

*. د بەرپەڕێ ٨١ێدا وەداعی ئەڤ دو مالکە نڤیسینە:
وداعى هديهء ناچزمى آورده ام چون خود حقير
دارم امّـيــد وتـوقّــع از عـنـــايـت در پـــديـــر

*. ناڤێ سەیدایێ وەداعی "سلێمان" بوویە, ئەوی شعرا نمرە ٦١ پێ ڤەهاندییە,
ل جهەکی ناڤێ سەیدای هۆسا هاتییە:
گلى بينم ميانى اهل عرفان
مبارك نام استادم سليمان

پاشی دبێژیت:

**وداعی از دعا محروم مگردان**
**كه تا هستم ترا باشم ثناخوان**
**تو این تلمیذ مگردان از دعاكم**
**بكردم ختم آن والله اعلم**

## پێچنجین (تخمیس)

پێنجین د هۆزانێدا ئەوە: كو هۆزانڤان دومالكییەكا كەسەكێ دی بینیت و سێ مالكێت دی هەر ل سەر وێ كێش و رێزبەندێ دانیتە بەری وان دومالكییا, دبێنە ڤێ كریارێ پێنجین چمكی ئەو هەردو مالكێت ئێك بەند دبنە پێنج مالك. هندەك هەنە هەرسێ مالكێت خۆ ددانن ناڤبەرا هەردو مالكێت رەسەن دا. جار ژی هەیە چار مالكا ئان پێنج مالكا ئان شەش مالكا بەری دومالكییا رەسەن دادنن, جار دبێژنە ڤی كاری "شەشین" ئان "حەفتین" و ...هتد.[1]

وەداعی ئێكە ژ وان شاعران یێت گەلەك شەهرەزا دكارێ "پێنجین"ێدا. وی سێ هۆزانێت جامیێ شاعرێ ب ناڤودەنگێ فارس كرینە پێجین, نمرە: (٣, ٩, ٥٥). دیسا هۆزانەكا حافزێ شێرازی كریە پێنجین, نمرە: (٢٠). هەروەسا هۆزانەكا فارسی یا شاعرێ كوردێ مەزن, پەرتوییێ هەكاری پێنجین كرییە, نمرە (٥٦).

## ڤەهاندنا لسەر حەرفێت ئەبجەدێ

ئێك ژ حنێربەندییا هۆزانڤانێ زیرەك و دەستهەل ئەوە كو بشێت هۆزانێ ل سەر حەرفێت ئەبجەدێ ڤەهینیت, ئانكو بۆ هەر حەرفەكێ بەندەكێ دانیت. وەداعی ئەڤ حنێربەندییا هۆزانێ بسەركەڤتی د هۆزانەكا خۆدا بكار ئینایە, كو

[1] . جبور عبد النور: العجم االادبی, ص ٦١. دار العلم للملایین, بیروت, ١٩٧٩.

هەمی حەرفێت ئەبجەدێ ژ ئەلیفێ حەتا یایێ تێدا خەبتاندینە. بەراهیا وێ دبێژیت:

**ب مثلێ تە نەهن مەوزوون و زیبا**
**د لبسێ ئەطلەس و خارا و دیبا**
**ئەزم ئامانج تیرێ قەوس ئەبروو[1]**
**بکە دەرمان برینا من طەبیبا**

## جهێ وەداعی ددیرۆکا تۆرەڤانیا کوردیدا

ئەم دشێین شعرا کوردی یا کەڤنار بکەینە سێ جوین:

جوینا ئێکێ: کو ژ نیڤا دویێ ژ چەرخێ پازدێ سەرهەلدایە, ئەوان شاعرا بەرێ بنیاتێ شعرا کوردی دانایە و پشتی وان هەمی شاعرێت کوردا لسەر دەوسا وان چووینە. ئەو ژی ئەڤەنە: عەلی حەریری, فەقیێ تەیران, مەلایێ جزیری و شەمسەدینێ ئەخلاتی.

جوینا دویێ: مەلایێ باتەیی, ئەحمەدێ خانی, پەرتوویێ هەکاری. ئەڤان ژی چەرخێ هەڤدێ سەرهەلدایە. ئەگەر چ ئەو ژ ڤەرێژا شاعرێت جوینا ئێکێنە, لێ دیسا شیاینە ببنە خوندنگەهـ و پێت پشتی وان لسەر شۆپا وان بچن.

جوینا سیێ: شاعرێت ڤێ جوینێ ژ چەرخێ نۆزدێ سەرهەلداینە, پێت ب ناڤ و دەنگ: شێخ نور الدینێ بریفکی, نالی و وەداعی. دگەل ڤان هەرسێ جوینادا شاعرێت دی ژی هەنە, کو مە ناڤێت وان نە ئینناینە, لێ پێت کو بووینە ستێرکێت گەش د تورەیێ کودیدا, ئەون پێت مە ناڤکرین. ئو پێت مایی ژی ئەم دکارین لدوی وی چەرخێ ئەو تێدا ژیاین, لسەر ڤان هەرسێ جوینا پارڤەکەین.

---

[1] .Ezim amanc-i tîrê qews-i ebrû

ئەڤ هەرەسیٚ شاعریٚت جوینا سییٚ, سالیٚت ژدایکبوونا وان نیزیکی ئیٚکن, شیٚخ نورالدین و وەداعی د ئیٚك سالدا بووینە, نالی ژی پشتی وان دەھ سالا ژدایك بوویە. ژدایکبوونیٚت وان هوٚسانە: شیٚخ نور الدینیٚ بریفکی سالا ١٧٩٠, وەداعی سالا ١٧٩٠ و نالی سالا ١٨٠٠.

گەلەك کەسیٚت نەزان هەنە, دڤێن شاعرەکیٚ چەرخیٚ نوٚزدیٚ و ئیٚکیٚ چەرخیٚ شازدیٚ داننە د ئیٚك ترازیدا, وەکی ئیٚك سەرەدەرییٚ دگەلدا بکەن و ئەگەر تە ناڤیٚ ئیٚکیٚ چەرخیٚ شازدیٚ ئینا, دڤیٚت ییٚ چەرخیٚ نوٚزدیٚ ژی بینی. ئەڤ کەسیٚت هەنیٚ ددیروٚکیٚ ناگەهن, نزانن کو هەر چەرخەکی سیاریٚت خوٚ هەنە, سەروبەر و کاودانیٚت هەر چەرخەکی ژی ب رەنگەکینە, لەوانیٚ, ئەم دشیٚین شاعریٚت چەرخیٚ نوٚزدیٚ ژ شاگردیٚت بچویکیٚت شاعریٚت چەرخیٚ شازدیٚ دانین, تنیٚ ئەم دکارین, نالی دگەل وەداعی هەڤبەرکەین و دانینە د ئیٚك ریٚزدا, دیسا وەداعی دگەل شیٚخ نور الدینیٚ بریفکی, کو هەرسیٚ د ئیٚك چەرخ دانە و بازا وان یا شعریٚ ژی نیٚزیکی ئیٚکە.

## گوٚتنا دویماهییٚ

گەلەك پیٚدڤییە هەرگاڤ بوٚ خوندەڤانا بهیٚتە دیارکرن, کو بەلکی ئەو ژی دزانن, ئەڤروٚ خەتەرەکا گەلەکا مەزن ل سەر کرمانجییٚ هەیە. خەتەر نە بەس ژ لاییٚ دژمنانڤە تنیٚ هەیە, بەلکی یا ژ هەمیا بترستر ژ لاییٚ دوٚستانڤەیە, ئەگەر ئەڤروٚ کرمانجی د خوندنگەها و تیٚلەڤزیوٚنادا هاتە بەربەندکرن, سبەهی دیٚ د کتیٚب و روٚژنامادا ژی هیٚتە بەربەند کرن, ئەگەر ئەڤە ژی بجھ هات, دیٚ وەختەك هیٚت ئاخڤتنا ب کرمانجی ل جهیٚت رسمی ژی هیٚتە بەربەند کرن, پشتی هنگی هەر کەسیٚ ب ڤی ئەزمانی باخڤیت دیٚ بیتە خوٚجهیٚ دەرەجە دو ئان سیٚ. هەروەکو ئەڤ تشتە ل کوردستانا تورکیاییٚ ب سەریٚ کوردییٚ و کوردا هاتی!! ئەو سەربوٚڕ هەردەم ل پیٚش چاڤایە.

د ژیانا جڤاکادا دو تشتیٚت گرنگ هەنە, ئەگەر هەردو تشت هەبن جڤاك دژین, ئەگەر نەبن دمرن, ئەو ژی "ئەزمان و ئاخ"ن, هەر گاڤا ئیٚك ژڤانا نەما, ئەو ملەت ژ

ملەتینیا خوٚ دکەڤیت و وی چ هەبوون ددنیاییێدا نابن. ئەگەر چ ئەو ملەتێ مەلایێ جزیری، فەقییێ تەیرا، ئەحمەدێ خانی، پەرتوێیێ هەکاری و ییێت دی هەبن، چ جارا نا مرن، لێ بەربەندکرن، کاروانێ پێشکەتنێ بدەها سالان رادوەستینیت و خوٚ بێدەنگکرنا لسەر بەربەندکرنێ ژی مروڤی دکەتە کوٚلە و بەندەکێ بێ بزاڤ و دیروٚك وی دناڤ پێلێت خوٚدا دادعویریت. هەر ملەتەك دەمێ شوٚرەشەکێ دکەت کوڕ و کچێت خوٚ گوٚری دکەت، هەمی سەرخاترا وی ئەزمانییە، ئەگەر ئەزمانێ مە عەرەبیبا مە شوٚڕش دژی عەرەبا نەدکر، لێ ژبەرکو ئەزمانێ مە کرمانجی بوو، لەوا مە شوٚڕەش کر و ب هزارا گوٚری پێشکێش کرن، ئەڤجا ئەگەر ئەڤروٚ ددەمێ ئازادبوونێدا ژنوی ئەزمانێ تە بهێتە بەربەند کرن، پا ئەو چ شوٚڕەش بوو مە کری!!

ئەگەر شاعرەکێ وەکی وەداعی و ییێت بەری وی و پشتی وی زانیبا دێ ملەتێ وان لسەر خوٚ قەبوول کەت زاڕوٚکێت وان ب ئەزمانەکێ دی بخوینن و ئەزمانێ خوٚ کەنە گوٚری، باوەر بکەن دا هەوارێت وان عەسمانا هژینن، دا تف و لەعنەتا لسەر شەرمزاریا مە بارینن.

**سەعید دێرەشی**
**٢١/ ١٢/ ٢٠٠٧**

# پێشگۆتن

ب سەدان سالا ل سەرانسەری کوردستانێ د مزگەفت و خواندنگەهێت ئۆلی دا ئەزمانێ کوردی ب رەخ ئەزمانێت عەرەبی و فارسی ڤە دهات خاندن, رەوشا خاندنێ ب کوردی ل خاندنگەهێت ئۆلی هەتا ڤێ داویێ ژی گەلەك پێشکەتیتر و باشتربوویە ژ رەوشا خاندنێ ل ژێر دەستێت داگیرکەرێت کوردستانێ و باشتر بوویە ژ وان خاندنگەهێت ب کوتەکی ل سەر گەلێ کورد هاتینە دانان.. ئەگەر ئەم بنێرینە دیرۆکا تۆرەڤانیا کوردی ژ دەسپێکا وێ و هەتا دەمەکێ نە دوور, دێ بۆ مە خویابیت کو تەڤایا تۆرەڤان و هەلبەستڤانێت کورد دەرکەتییێت وان خاندنگەهان بووینە, بگرە ژ فەقییێ تەیران (١٥٥٧=١٦٤٠) هەتا دگەهیتە ئەحمەدێ نالبەند (١٨٩٠=١٩٦٤). دڤی چاخێ دوور و درێژێ دناڤبەرا ڤان هەردو هەلبەستڤانان دا, ب دەهان کەنکەنە و زانا و شاعر و فەیلەسوفێت ژێهاتی دناڤا کوردان دا دەرکەتینە, گەلەکا ژ وانا ڤەرێژا وان د مەیدانێ دایە و گەلەکێت دی ژی (مخابن!) دمزگەفت و خواندنگەهێت ئۆلی دا تەڤی گوندان هاتینە شەوتاندن و سۆتن و دزین, کەت ومەتێت مایی ژی ل ڤێرێ و وێراهە تێت دیتن.

وەداعی, ئێکە ژ وان هەلبەستڤانێت کلاسیك یێت هەتا نها ناڤێت وان ل چ جها نە هاتینە دیتن و بهیستن, ئەڤ هەلبەستڤانە یێ بووی و مەزن بووی و مری, کەسێ ناڤێ وی نە ئینایە, دیوانەکا هەلبەستان یا بەرکەتی پاشخۆڕا هێلایە, هایا کەسێ ژێ نەبوویە, جارەکێ ژ جاران, کەسێ هزر نە کری یە, کو هەلبەستڤانەکێ مەزنێ بەرزە مینا وەداعی ئەڤرۆ ژ کاروانێ خۆ یێ وندابوون و بەرزەبوونێ ڤەگەڕیت. لەوڕا ئەز گەلەکێ شامە, کو ئیرۆ بەری هەر کەسەکی من پێشوازیا ڤی رێڤینگی کر و دەستێت خوە تێوەرکرن و هەمبێز کر.

ئەز بخۆ ئەڤیندار و حزکری یێ هەلبەستا کلاسیکا کوردی مە.. دکارم ببێژم کو پڕانی یا ژینا خۆ من دگەلدا بووراندی یە.. ئو هندەك من لسەر کارکرییە و هەردەم ژی ئەز ل دوی دەستنڤیسان گەریایمە و من پسیار کرییە.. گۆتنا مەزنا

دبێژیت: ((گەریان دریانە, قسمەت سەر پیانە)). راستە مرۆڤ ل دویچوونێ و گەریانێ دوەستیت, لێ قسمەت تێنە دەستێ مرۆڤی.

ڤێ جارێ پرسا من ل سەر ئەوروپا بوو, کا جا دەسنڤیسێت کوردی ل ئەوروپا پەیدا دبن یان نە؟! ئو ئەو گەرۆکێت بەرێ, هاتینە کوردستانێ و ڤەگەراین, تشتەك دگەل خۆ ئینایە وەلاتێت خۆ ئان نە؟. هەر د کەڤندا ئەڤ پرسە د سەرێ من دابوو.. ئەلمانیا ژی ئێکە ژ وان وەلاتان یێت گەلەك گەرۆك و رۆژهەلاتناس ژێ دەرکەتینە دنیاییێ, نەمازە هاتینە کوردستانێ.. ئو د بەرێ دا ژی من بهیستبوو کو, د STAATSBIBLIOTHEK ا بەرلینێ دا, چەند دەسنڤیسێت کوردی هەنە, لێ من هزر نەدکر کو تشتەکێ نوی تێدا هەبیت, یان هەلبەستڤانەکێ نوی ل وێرێ بهێتە ڤەدیتن. من دانابوو ژی جارەکێ بچم ببینم, دوور نینە بەیتا ((بەرصیصێ عابد)) یا فەقییێ تەیران, یان هەلبەستەکا وی یا دی تێدا بیت.. ژبەرکو نهۆ ئەز مژوولی لێکدانا تەڤایا بەرکارێ وی مە.[1]

باژێرێ ئەز لێ ئاکنجی Neuss پێتر ژ ٦٠٠ کم ژ بەرلینێ دوورە.. ب شەمەندەفرا داویا ئینییێ مرۆڤ ب ٩ نەه سەعەتان دگەهیتێ. بەری وێ رۆژا کو ئەز بدەم رێ, هێژا پرۆفیسور جەلیلێ جەلیل ژی هاتبوو بەرلینێ, ژ بۆ چاپکرنا بەیتا ((سیف الملوك)) یا هەلبەستڤان سیاهپووش, من و وی و هێژا کەریم بیانی حەفتی یەکێ ل سەر ڤێ بەیتێ کار کر. د ڤێ هەڤدیتنا مەدا, هێژا جەلیلێ جەلیل بۆ من دا خویا کرن کو, دەسنڤیسەك ب ناڤێ وەداعی د پەرتۆکخانێ دا هەیە, گەلەك سوپاسیا وی دکەم.

رۆژا ٣١/٧/ ٢٠٠٠ێ ئەز و هێژاییێ ناڤبری چووینە پرتۆکخانێ, کو ئەوی ژی پرۆژێ (رێبەرێ دەسنڤیسێت کوردی) د دەستدایە.

ئەز د ناڤا دەسنڤیسان گەریام و من گەلەك دیتن: دیوانا مەلاییێ جزیری, شێخێ صەنعانی, مەم و زین, نووبهار, مەولیدا مەلاییێ باتەیی... وچەندەکێت دی. پرانی یا وانا یێت هاتین چاپکرن و دەسخەتێت وان ژی ل جهێت دی مشەنە.

---

[1] . د وی دەمێ من لسەر وداعی کاردکر و بریە دویماهیێ, هێشتا من دیوانا فەقیێ تەیران چاپنەکربوو, بەلکی ژنوی من دەست ب تویژاندنا وێ کربوو.

تشتێت ب بها کو بەرچاڤێت من کەتین, دەسنڤیسەکا شێخێ صەنعانی, دەسنڤیسەکا دی یا فارسی, کو تێکستەکا بەیتا شێخێ صەنعانی تێدا هەبوو و دیسان هەلبەستەکا عەلی حەریری, کو هێشتا بەلاڤە نەبوویە, دەسنڤیسەکا دی یا بەرکەتی, کو پتر ژ دەه هەلبەستێت کلاسیك یێت نەهاتین بەلاڤکرن تێدا هەنە. ئو ئەڤ دیوانا وەداعی یا کو نهۆ ل بەر دەستێت مە.

ب راستی ئەڤ تشتێ من گۆتی ب دەڤ ساناهی یە, لێ ب کریار هەتا مرۆڤ دەسنڤیسەکێ کوپی دکەت, زۆر و زەحمەتە, من داخوازا ڤێ چەندێ ژ کاربدەستێت پەرتۆکخانێ کر.. ل وێرێ کۆپی کرن نابەیە, تنێ رێ یەك هەیە, ئەو ژی ((مایکروفیلم)) کرن, ئەڤێ رییێ ژی گەلەك دراڤ تێدچیت, لێ دلێ وێرێ یە, یا ب ئاستەنگتر پێتڤی بوو من ئالاڤا کوپیکرنا مایکروفیلمی ل مالێ هەبت, ئەو ژی بۆ من گەلەك چەتن بوو.. لێ ئەز یێ رژدبووم کو کوپیێ ڤان دەسنڤیسان دەربێخم, ئەگەر هەر نەبوو دڤێت هەوارا خۆ بگەهینم رێڤەبەری. ژنەك ژ کاربدەستێت پەرتۆکخانێ, ناڤێ وێ Melita Multani بوو, من چیرۆکا خۆ و یا دەسنڤیسێت کوردی ژێرا گۆت, هەر تشتەکێ من ڤیای وێ ژ من را ب جە ئانی, ئەز باوەر دکەم ئەگەر هاریکاریا وێ نەبا ئەڤ کارە دا نیڤەرۆ مینت. لەورا ژی – هەروەکو من سۆز دایە وێ بخۆ – ئەز پێش خۆڤە و پێش دلسۆزێت تۆرەیێ کوردیڤە ژ دل سوپاسێت خۆ پێشکێشی وێ دکەم.

دەسنڤیسا دیوانێ د STAATSBIBLIOTHEK ا بەرلینێ دا ل بن ڤێ هەژمارێ هاتی یە پاراستن Ms. Or. Oct.1081 دەسنڤیس ل سەر دەفتەرەکا قەلافەت بچووك هاتی یە مەشقکرن, کالۆخکێ وێ یێ هەردو ئالا ب کاغەزەکا رەق و ستوور لێکدایە و جزیبەند کری یە, رووپەرێ ئێکێ ب ڤێ هەڤۆکێ دەست پێ دکت: ((هو المستعان وعلیه التکلان, دیوان وداعی رحمه الله)). ئو ل دویڤدا هەلبەستەکا فارسی تێت. دیوان هەموو نیزیکی ٨٢ (*) بەرپەڕایە.. بەرپەڕێ داوییێ هەلبەستەکا ب کوردی تێدایە, نەهات خاندن..(**)

(*) . د چاپا بەرلینێ دا (٨٨) هاتیە نڤیسین, لێ یا راست (٨٢) رووپەلن.

(**) . پشتی بو جارا دوییێ ئەز چوویمە پەرتۆکخانێ, ئەڤ هەلبەستە ب کوتەك و زۆر من خواند و نهۆ د گەل دیوانێ یە.

دەسنڤیس, ل هن جهان ب ساناهی تێت خاندن, ل هن جهیان ژی ب زۆر و زەحمەت. لبا نژاد (نسخا ئەصلی) خۆشتر تێت خاندن, لێ یا کۆپی, گەلەك جه هەر د بنێرا ناهێن خاندن, ژبەر ڤێ سەدەمێ من گەلەك هەلبەست ب قەلەمی هەر د پەرتۆکخانێ دا ڤەگوهاستن.. پەیڤ ژی مشه هەبوون د لبا کۆپی دا نه د هاتن خاندن.. دیسان من هانا خۆ دبره جەم لبا نژاد.. تشتێ ژ ڤێ ژی ئاسێتر, هندەك بەرپەڕ د لبا نژاد دا ژی هەبوون, حوبرێ وان هەشفتی بوو, ب رۆژان ئەز کەتم بەر هەتا من لێکداین و بسەروبەر کرین.. دیسان هندەك پەیڤ هەر نه دهاتن دیتن, ئەو ژی ل پەی جه و رامان و پەژن و تەڤنێ هەڤۆکان, مە کاری وان پەیڤان ڤەژینین.

سەرێت لێڤێت گەلەك بەرپەڕان دڕیاینه و پەڕتینه, پڕ جاران پیت ژێ کەتینه, پڕ جاران ژی پەیڤ یان نیڤا پەیڤێ ژێ فڕی یە..

هەلبەستێت کوردی و فارسی ژێك نەهاتینه جوداکرن, هەمی تێکەلی هەڤن, بۆ میناك, جارنا سێ هەلبەستێت فارسی مەشقکرینه, پاشی ل پەی هەلبەستەکا کوردی هەیه. جارنا ژی دو هەلبەستێت کوردی, ل پەی وان چەندێت فارسی تێن.. ئو هەتا داویا دەسنڤیسێ ب ڤی رەنگی یە.

مخابن نه دیرۆکا مەشقکرنا وێ, نه ژی ناڤێ مەشقڤانی ل سەر دەسنڤیسێ نینن. دەما مرۆڤ بەرپەڕێت دەسنڤیسێ ڤەددەت و باش لێ مێزه دکەت, مرۆڤ وەسا هزر دکەت کو, وەداعی بخۆ مەشق کربیت, ژبەرکو لسەر بەرپەڕەکی خەتمەکا گرۆڤر هەیه و مالکەك ژ هەلبەستەکا وەداعی د ناڤدایه.. ئێك – دو خەتمێت دی ژی ل جهەکێ دی هەنه, لێ ناڤا وان ناهێت خواندن.. گەلەك جارا ژی دێ بینی چەند مالکێت شعرێ یێت سەربخۆ ل سەر هندەك بەرپەڕان هەنه, هزرا مرۆڤیبۆ وێرێ دچیت, کو دەما تشتەك کەتبیت سەرێ وەداعی ئێکسەر نڤیسیبیت, لێ تشتێ مرۆڤی تێخت گۆمانێ ئەوە, دەسپێکا دیوانێ ئەڤ هەڤۆکا هەنێ هاتی یە: ((دیوان وداعی رحمه الله)), هەڤۆکا (رحمه الله) تنێ بۆ کەسێ مری تێت گۆتن, ژبەر وێ چەندێ ژی ئەم نکارین بێژین, کو ئەڤە دەسخەتێ وەداعی بیت.

پێتڤی گۆتنێ یە کو هەتا نهۆ ژی گەلەك دەسنڤیس د پەرتۆکخانێت ئەورۆپا و رۆسیا و هن وەلاتێت دی دا هەنه, ئەگەر بهێت و بهێنه ڤەژاندن و چاپکرن, دێ

روویێ دیرۆك و تۆرەیێ كوردی ب ئێكجاری هێتە گوهرین وگەلەك تشتێت كو نە د هزرا مەدا هێنە ئاشكرا كرن. ئەڤرۆ ژی دەم ییێ هاتی كوئەڤ بەرخۆرە بهێتە مەیدانێ, كەسێت زیرەك و تێهەیی, زەند و باسكێت خۆ هەلدن و وان فێرس و پەهلەوانا ڤەژینن ییێت ب تبلێت خۆ دیرۆكا مە ب زێری نەخشاندی.

هەروەكو مە بەرێ گۆتی, هەلبەستێت كوردی و فارسی د دەسنڤیسێ دا ژێك نە هاتینە جوداكرن.. ئەڤجا مە ژی ل پەی رێزكرنا مەشقڤانی هەلبەست رێزكرینە.. لێ تشتێ مە كری, هەلبەستێت ب كوردی ژ ناڤ دەرخستینە, ژ ییێت فارسی جودا كرینە, لێ ئەو ژی مە ل سەر رێزا وان هێلایی نە. ییێت فارسی ژی هەر ل پەی وێ رێزكرنێ هاتینە.

تشتێ كو هزرا من گەلەك پێ مژوول, ئەوبوو كا ئەز دێ چاوا شێم هەلبەستێت فارسی بێ شاشی ڤەژینم. پشتی من ل سەر كومپیوتەرێ تایپ كرین, چەند جاران ئەز ب سەردا هاتم و چووم و هەوارا خۆ برە بەر قامووسێت ب فارسی, لێ دیسان نەشیام ژ شاشی یا رامالم, ژ بەركو ئەز د زمانێ فارسی دا نەییێ شەهرەزا و رەهوانم.

ڤێ داوییێ هەڤالێ هێژا پەرویزێ جیهانی, كو ل سویسرایێ خۆجهە, بوو مێهڤانێ من, هەلبەت ئەو ژی ئێكە ژ وان كوردێت شەهرەزا د زمانێ فارسی دا و نڤیسینێت وی ییێت ب فارسی ژی هەنە. ئەوی د گەل من گەلەك زەحمەت بر و ب دەهان شاشی د دیوانێ دا راستڤەكرن. ل سەر ڤی كارێ برایێ من یێ هێژا پەرویز جیهانی كری, سوپاسییێت خۆ ییێت گەرم ژێرا پێشكێش دكەم.

دیوانا وەداعی من ل سەر سێ پشكان پارڤەكر. پشكا ئێكێ: ژین و سەرپێهاتی. پشكا دوییێ: هەلبەستێت ب كوردی. پشكا سییێ: هەلبەستێت ب فارسی. ل داوییێ ژی: فەرهەنگۆك. د فەرهەنگۆكێ دا تنێ مە چەند پەیڤێت مەعناییێت وان بزەحمەت د پشكا هەلبەستێت ب كوردی دا راڤە كرینە. ژبۆ راڤەكرنا پەیڤێت فارسی مە قامووسا ((فرهنگ یك جلدی/ فارسی-عربی)) یا د. محمد التوینجی ژ خورا كری یە ژێدەر.[1]

---

[1] د. محمد التونجی.. دكتر زبان و ادبیات فارسی از دانشگاه تهران. دكتر ادبیات عرب از دانشگاه دمشق.. فرهنگ یك جلدی/فارسی=عربی, انتشارات هیرمند ١٣٧٧, چاپ دوم.

## چەرخێ وەداعی تێدا ژیای

وەداعی د چەرخەکێ گەلەك گرنگ د دیرۆکا کوردستانێ دا ژیایە, ژ لایەکی میرگەهێت کوردان وەرار کربوون, بنگەهێت خۆ یێت ئابووری و چاندی و لەشکەری پێشدا بربوون, هزرێت نەتەوەیی تێدا شینبوبوون, پرانی یا میرگەهان شکلەکێ سەرخۆبوونا خۆ پاراستبوو و ل ژێر دەستێ ئۆسمانی یان دەرکەتبوون. وەداعی د بن کارتێکرنا ڤێ رەوشێ دا هاتی یە تاشاندن ( تەربیەت کرن ), هزرا نەتەوەیی د سەری دا هاتی یە چاندن. هزرا نەتەوەیی ژی د وی چاخی دا گرێدایی میر و سەروەران بوویە, گرێدایی دەسهەلاتداریا میرگەهێ بوویە.

ئو ژ لایەکێ دی, ئۆسمانی ب خەتەرا سەربخۆبوونا میرگەهان حەسیان, ترسا وان ژ وێ ترسێ بوو کو, کوردستان ژ بن دەستهەلاتا وان دەرکەڤیت, ئێدی دەست ب ئێریشێت مەزن کرن, سەر و بنێت کوردستانێ بوون مەیدانا شەرەکێ بێ یەمان, ب دژواری میرگەهێت کوردان هاتن هەرشاندن و گەلێ کوردستانێ کەتە دبن ڤەبراندن و ڤرکرنێ دا.

وەداعی هەلبەستەکا دوور و درێژ, یان بێژین زێمارەك ب کوشتنا ئێك ژ میرێت کوردا یێت وی چاخی ((شێخی بەگ)) میرێ مکسێ گۆتی یە. وەها دیار دکەت کو ئەڤ میرە ب شۆرشەکێ رابوویە. وەداعی ناڤ ل سەر ڤی میری دانایە ((جهانگێرێ جهان)). ل ڤر ژی چەند روودانێت وێ شۆرشێ وەك وی گۆتین دێ ڤەگێرین:

((روومی یان, ئانکو ترکان, لەشکەرەکێ بێ حەدد و دەفتەر هنارتە سەر میر, لێ وی ل بەرەڤانی ل خۆ کر و لەشکەرێ وان کەر کەر کر و ڤریا وان ئینا.. وی گەلەك وەلات و دەڤەر ژ روومێ وەرگرتن. هاریکاریا هێز و لەشکەران بۆ وی ژ بۆهتان دهات.. خەرج و خەراج ژ بەحران دهات.. شکاکی و وانی و ئەرتووشی دژی ڤی خەباتگێری بوون.. هیزانی, شێروانی و جزیری هەردەم بۆ وی دبەرهەڤبوون و د هاتن هاریکاریا وی.. روومی یێت قەلس و بێ زراڤی وەکی توورا د ئاڤێدا ژ بەر د لەرزین.. سەرحەد ژی دهاتن سلاڤا وی.. میرەکێ وەکی وی یێ هممەت بلند د کرمانجیێ دا هەتا عەجەمستانێ نەبوو.. ئەڤی میری فەرمان ل

بەحران دكر و سەروەری ل (وەستان) دكر.. ئەوی نە تنێ وەستان ئێخستە بن دەستێ خۆ، لێ زۆزان ژی کەتن بن دەستێ وی و هەتا جهێ بۆهتان.. هەردەم هزار مێر ل جڤاتا وی بوون.. تەقدیر یا حەقە و بەتال نا بیت، چەرخا فەلەکێ موهلەت نەدا چاڤێت وی یێد بەلەك..))

پاشی دبێژت: ((شێخی بەگ، لەشکەرێ خۆ د گەل خۆ بر و چوو چیا.. ل وێدەرێ (ژۆری)یان، شاندە پەی وی و سەد سووند و عەهد ژێرا کرن –مەکرێ ژنان هەر حازرن– وەسا دیارە ژنەك ب کارێ کوشتنا میری رابوویە.. لەورا میر بری‌نە حەرەمگەهێ و دەستوور نەدایێ ل قەسرێ بێتە خوارێ.. حققەبازا حیلەکار، ئانکو ئەو ژنا فێلباز، خەنجەرا میری ژێ ڤەشارت هەتا کو رازای و د خەو چووی، هنگی نەصرانی یان چاررەخێد وی گرتن و کوشت)).

پشتی میر تێت کوشتن دڤێ شوونگرەك شوونا وی بگریت.. وەداعی دبێژت: تنێ خان مەحموود دشێت ڤی کاری بکەت، ل جهێ شێخی بەگ روونیت.

ئەوی دیرۆکا کوشتنا وی ب تیپێت ئەبجەدێ نڤیسی یە، کو دبیتە سالا ١٢٣٧مش بەرامبەر ١٨٢١زا. دبێژت:

یا قەنج ئەوە ئەم ڤێ بکەین
ناڤی ل تاریخێ بدەین
بۆ غەین و رێ و لام و زەین
٧ ٣٠ ٢٠٠ ١٠٠٠
کانێ جهانگێرێ جهان

ناڤێ شێخی بەگ د چ ژێدەرێت دیرۆکێ دا نە کەتە بەر چاڤێت من.. دیسان چ ئاور ژی بۆ شورشا وی نە هاتینە دان.. لێ تنێ چیرۆکەکا دوور و درێژ د کتێبا ((جامعی یێ رسالەیان و حکایەتان، ب زمانێ کورمانجی، یا (مەلا مەحموودێ بازیدی و ئسکەندەر ژابا)ی دا هاتی یە، د ڤێ سەرهاتیێ دا ب درێژی چیرۆکا کوشتنا (شێخی بەگ) تێت ڤەگێران. ئەڤجا ژبەرکو ڤێ سەرهاتیێ گرێدانەکا مکوم ب کاکلا مژارا مەڤە هەیە، مە دیت باشتر کو تێکستا چیرۆکێ ب تەڤاڤی د ڤێرێ دا بینین خوارێ. ئەڤا ژێری ژی تێکستا وێ یە:

(( ژ بەگزادەییێد هەکاری یان شێخی بەگ هەبوو, مامێ خان مەحموود میرێ قەضا مکسێ بوو, لاکن زێدە ژێهاتی و جامێر و خوی روشد و رەشادەت د وێ وەقتیدا ناڤ و دەنگ هەبوویی, هەموو کەس ژێ د طرسان و هندەکان دەخەسی د کرین و ئەو ب خۆ ژی ل مکسێ میر بوو. میرێ حەکاریان ئبراهیم خان بەگێ ژ ڤی کرییە دەخەسی و لێ د خەبتی, کو بەلکو ب دەست بینە و بکوژە, ممکن نەدبوو, خوهەکی ئبراهیم خان بەگێ میرێ حەکاریان هەبوو, ژنا میر شەرەفێ میرێ قەضا شاخێ بوو و ئەو میر شەرەف فەوت بووبوو و خوها ئبراهیم خان بەگێ عادلە خانم د گۆتن, ل شوونا مێرێ خۆ میر شەرەف د کەلا شاخێ دا حاکم بوو و ئەوێ عادلە خانمێ زاف مال و دراڤ و مجەوهەر هەبوون.

ئیجاری ژ پەنی ڤە, ئیبراهیم خان بەگێ ڤرێ کری یە نك خوها خۆ عادیلە خانمێ, کو تو دکاری ب تەرزەکی شێخی بەگێ بینی کەلا شاخێ نك خۆ و بدی کوشتن, تو ژنی, ئەو فکرا کوشتنێ ژ تە ناکەتن. ئیجاری عادلە خانم مرۆڤەکی ژ ئەهلێ حەرەمێ ڤرێدکە نك شێخی بەگ, گو بلانێ بێتە کەلا شاخێ ئەز و ئەو یەکو دو ببینن و خەبەر بدەین, مەراما من هەیە, کو ئەز شێخی بەگێ مار بکەم و هندە مال و تەجەمولا من هەیە و من ئەولاد نینن, ئەڤە کەلا و ئەڤە مال ئەملاك بلانێ بگەهنە شێخی بەگێ. وەکو ئەڤ خەبەرا ژبوویی شێخی بەگێ دچت ئەو ژی ڤێ خەبەرێ راست حسێب دکەت و هوسا جوانی وطەمەعا خانم و مالێ ددەتە سەری. جەوابێ ڤرێدکە, کو بەلێ ئەز دێ د گەل صەد و دوصەد مرۆڤان فلان رۆژێ بێمە کەلێ, بلانێ خانم د تەدارەکێ دا بی. وەکو جەوابا هاتنا شێخی بەگێ دگەهە عادیلە خانمێ ئەو ژی دبێژە مرۆڤێد خۆ بلانێ شێخی بەگ دگەل دەه ئەتباعێد خۆیی موقەررەب ل سەرێ کەلێ ببنە مێوان و مرۆڤێد مایی ل ژێری هێشەتێ بدەنە خەلقێ مێوان و عادیلە خانم ڤرێدکە ژ مخینان دەه مرۆڤێد گربز و ب قووەت خۆیی تفنگ و خەنچەر, وێ رۆژا کو دپێ شێخی بەگ بێتن ئەوان مخینان گۆیا ژ بوویی خزمەت تینتە کەلێ. ئیجاری وەکو شێخی بەگ تێتن و دچتە سەرێ کەلێ پەیا دبت, حەرەم کەهیاسی دبێژە شێخی بەگێ, گو میرم! خانم دعا دکە و دبێژە, کو بلانێ میر دگەل دەه ئاغالەران بەبنە مێوانێ کەلێ و مرۆڤێد مایی ژی بەبنە مێوانێ هێشەتێ. شێخی بەگ ژی دبێژە بلانێ وسا ببە. ئەوان سەد و

دوسەد مرۆڤان ل هێشەتیێ بەلاڤ دکەن و میر دگەل دەھ ئاغالەران ل یالێ مێران ل سەرێ کەلێ ل دیوانخانەیێ دبنە مێوان, شەربەت و قەهوە و بخوور و گولاب ژ بوویی شێخی بەگێ تینن, کو خانم سلاڤ دکە, سەر سەران و سەر چاڤان هاتیە, بلانێ راحەت ببە, پاشی بشەڤ ئەز میر دخوزمە حەرامێ بلا بینن, ئەم دگەل یەکودو خەبەر ددەین. ئیجاری خانم تینە ئەوان دەھ مخینان تینە و دبێژە, کو ئەز دێ شێخی بەگێ بکوژم و داینمە ئۆطەیەکی حەرەمێ, کەنگی گازی وە دکەم هوون بچنە ئۆطەیا وی, شێخی بەگێ بدەنە بەر خەنچەران و بکوژین.

ئیجاری ئێڤاری تەعام و زاد ژ بوویی شێخی بەگێ ڤرێدکەن و ئیکرام ئیعزازێ دکەن, وەکو سێ ساعەت ژ شەڤێ دبۆرە ناڤمال تێتن فانووس د دەستیدا دبێژە شێخی بەگێ, کو خانم تە دخوزە حەرەمێ, کو دگەل تە خەبەردەت. ئیجاری مرۆڤێد شێخی بەگێ, کو دگەل بوونە ل دیوانخانەیێ دمینن, لەورانێ حەرەمخانیە کەس بیانی ناچتن و شێخی بەگ ژی باوەر کری یە, کو عادلە خانم دێ وی شوو بکەتن, رادبە و دچە حەرەمخانەیێ ئۆطەیێ. وەکو شێخی بەگ دچتە ئۆطەیێ دروونت دبینە, کو خانم ل وێ دەرێ نینە, پرسیار دکە, کو خانم کانێ, دبێژە شێخی بەگێ, کو خانم دێ نها بێتن. ئیجاری خانم ئەمرێ وان دەھ نەفەر مخینا‌ان دکەتن, پێکڤە دەست بە خەنچەر دچنە ئۆطەیێ و بالا شێخی بەگێ دکەن, دگەل شیخی بەگێ تنێ خەنچەر هەبوو, ئێدی چەك و سیلاح تونە بوون, ئێدی ئەگەر چ شێخی بەگ ددەتە خەنچەرێ لاکن بێ فایدە مرۆڤەك د گەل دەھ مرۆڤان دێ چ بکەتن, شێخی بەگ دوسێ مرۆڤان ژ وان بریندار دکەتن و ئەو مرۆڤ ئەوی ددەنە بەر خەنچەران تەمام دکەن.

ئیجاری خانم ئەمرێ وان مرۆڤان دکەتن, دچنە دیوانخانەیێ و ئاغایێد مرۆڤێد شێخی بەگێ دگرن و دشەلینن و حەبس دکەن و جەوابێ ڤرێدکەنە خەلقێ هێشەتێ, کو من شێخی بەگ دا کوشتن, بلانێ هەرکەسەك مێوانێد خۆ بگرن و بشەلینن و بەردین, ئیجاری خەلقێ هێشەتێ هەرکەسەك مێوانێد خۆ وەها بێ دەعوا و شەڕ گرتن و شەلاندین و بەردابن.

صوبەیێ ئیجاری لەشێ شێخی بەگێ ژ بەدەنا کەلێ ئاڤێتنە خوارێ و برین دەفن کرین و ئەو دەھ ئاغایێد مەحبووس کری ژی ڤرێکرن ژ بوویی میرێ

حەکاریان برایێ خۆ ئبراهیم بەگێ. وەکو ئەڤ خەبەرا کوشتنا شێخی بەگێ گهایە مکسێ مالا وی و کوڕێد مامێد وی خان مەحموود و خان عەبدال و خان ئەحمەد ئێدی ئەوانە ژی کرینە شین و ماتەم. ئێدی چ چارە لاکن دایم کەتنە قەصدا عادیە خانمێ و ئەوان مخینان. مدەت د نێڤدا بۆری, کوڕێ شێخی بەگێ هەبوو (مفت الله بەگ), لاکن قەوی زێدە جەسوور و رەشید بوویی, دوازدە سالی بوویی, جهێ بابێ خۆ و میریتا مەکسێ ضەبت کری و ئەڤ دەعوا ژی کەڤن بوویی, پاشی چار سالان ب خەف تەدارەك کری, کوڕێ شێخی بەگێ مفت الله بەگ سێ صەد مرۆڤێد بژارە بە شەشخانە هلگرتی و چەند ترەجە د گەل خۆ برین, نیڤێ شەڤێ دانینە بەر بەدەنا کەلێ و چووینە نیڤا کەلا شاخێ و عادلە خانم گرتن و مرۆڤێد وێ گرتن و هێشەتا ژی ضەبت کرین, پاشی ئەو مخین و چەندەك ژ شاخیان کوشتن و مال و ئەشیا و هەرچی کو عادلە خانمێ هەبوون هەموو ضەبت کرین و لاکن عادلە خانم نەکوشتن, ژ کەلێ ب دەرانین و شاندینە نك برایێ وێ حەکاریان و ضایعاتا مرۆڤێد خۆ ژ خەلقێ هێشەتێ ستاندین و مدەیەکی ژی قەضا شاخێ ضەبت کری, تەصەرف کرین. پاشی هندەك مدەیی مفت الله بەگ ئەجەلێ ئەمان نەدایێ, ب ئەمرێ خودێ فەوت بوویی. ئیجاری ئاغایێد هەرطوشیان کەلێ شاخێ ژ مرۆڤێد مکسیان دزین و ئەو بدەرانین.))[1]

روودانێت ڤێ چیرۆکێ و یێت هەلبەستا وەداعی نێزیکی هەڤن, نەخاسمە د راستا کوشتنا شێخی بەگ دا, چیرۆك ژی هەر د ڤی بازنی دا د زڤریت, لەوڕا ژی بەرفرەهتر ل سەر کوشتنا وی رادوەستیت, روودانێت کوشتنا وی بێ کێم و زێدەیی بەرچاڤ کرینە. دیسان د ڤێ سەرهاتییێ دا چەند خالێت گرنگ د دیرۆکا وی چاخی دا دیار دبن, ژ وانا دیاردبیت کو خان مەحموود برازایێ شێخی بەگ بوویە, خان مەحموود دو برایێت دی ژی هەبووینە, خان عەبال و خان ئەحمەد.

[1] . جامعیێ رسالەیان و حکایەتان ب زمانێ کورمانجی. تەرتیب و ب زمانێ فەرەنسیەیێ ترجمە دکر, ئسکەندر ژابا, د باژێڕێ پتربوغێدا د دار الطباعەیێ امثراطوریدا ١٨٦٠عیسەوی, ١٣٧٧هجرەتێ. ژ کتێبا دز فەرهاد پیربال, مەلا مەحموودێ بایەزیدی (١٧٩٩-١٨٦٧) یەکەمین چیرۆکنووس و پەخشان نووسی کورد. دیسان: ئالێکساندەر ژابا/ چیرۆکێن کورمانجی, چاپا لاتینی: جانکورد, وەشانێن چاندا نووژەن, ١٩٩٩ بپ ٤٧=٥٠.

هەروەسا عادلە خانمێ میراتی ل ((کەلا شاخێ)) و هاویردوٚرێت وێ کری یە, ئەو, خووشکا ئیبراهیم بەگێ میرێ هەکاریان بوویە. پشتی شێخی بەگ تێت کوشتن کورەکێ بچووك پاشخوٚرا تێلت, ئەوژی ((مفت الله بەگ))ە, پشتی مەزن دبیت ئەو, توول و حەیفا بابێ خوٚ ڤەدکەت. وەداعی دیار دکەت کو شێخی بەگ ب دەستێ نەصرانی یان هاتی یە کوشتن, د سەرهاتیێ دا ژی وەسا هاتی یە, کو دەھ ((مخینان)) ئەو کوشتی یە. نەصرانی و مخین هەردو ئێك رامانێ ددەن, ژبەرکو مخینی تیرەیەکا فلەهانن.

دڤێ سەرهاتیێ دا چ ئاور و ئیشارەت نە هاتینە دان کو شێخی بەگ دژی ترکان سەرهەلدایە, یان کوشتنا وی دەستێ ترکان د گەلدا هەبوویە, لێ د هەلبەستا وەداعی دا ئەڤ چەندە ب ئاشکرا دیار دبیت و دەستێ وان د کوشتنا وی دا هەبوویە. هەروەك مە دیار کری, چ ژێدەرێت دیروٚکێ ل سەر سەرهەلدانا ڤی میری نە ئاخڤتینە, لێ بەحسێ سەرهلدانێت بەری وی و پشتی وی هاتی یە کرن:

د کتێبا ((القضیة الکردیة)) دا, هاتی یە دبێژیت: ((سالا ١٨٢٠زا کوردێت زازا ل سێواسێ ب شوورشەکێ رابوون, چەند هەیڤا ڤەکێشا, ل داویێ چەك و جەبلخانێت وان نەمان و شوورش فەلشی و شکەست.. خوٚ ل چیان ئاسێ کر هەتا قریا وان هاتی)). دیسان دبێژیت: ((ئەو ژ سالا ١٨٢٩ هەتا ١٨٣٩زا گەلەك شوورشێت دی ل گەلەك جهێت هەکاری و رەواندز و توٚرئابدین رابوون و هەمی ژی فەلشین)).[1]

د وێ سەرهاتیا ژابای د کتێبێدا نڤیسی و مە ل ڤر ئانی, تێدا خویا دبیت, کو پشتی کوشتنا شیخی بەگ, کورێ وی ((مفت الله بەگ)) شوونا وی دبیتە میر.. لێ وەداعی د هەلبەستا خوٚدا دبێژیت, کو پشتی کوشتنا شێخی بەگ, کەسەك ژ ((خان مەحمود)) باشتر نینە, سەرڤەگێریا میرگەها مکسێ و هاویردوٚرێت وێ بکەت, هەر وەك دبێژیت:

---

[1] . د. بلەچ شێرگوە, القضیة الکردیة, ماضي الکرد و حاضرهم, جمعیة خویبون الکردیة الوطنیة, ص ٥٠.

**قەت مثلیٚ خان مەحموود یەکیٚ**
**نـــیـــنـــن د دەورا فــەلـــەکـــیٚ**
**خـوٚشبـت ل جـه شیٚخی بەکیٚ**
**کـانـیٚ جهـانـگـیٚـریٚ جـهان**

**شاعریٚ مە وەداعی چاوا بەریٚ, دەبیر و کاتبیٚ شیٚخی بەگ بوویە, دیسان بوویە دەبیر و کاتبیٚ خان مەحموود. لیٚ ئەڤ خان مەحمودە کی یە؟**

**هەروەك سەرهاتی ڤەدگیٚریت, خان مەحموود برازاییٚ شیٚخی بەگ بوویە, ئانکو شیٚخی بەگ مامیٚ ویبوو. هەروەك وەداعی ژی ڤەدگیٚریت خان مەحموود پشتی کوشتنا وی, ئەو ل شوونا وی میراتییٚ دکەت.**

**سالا ١٨٢١زا میر بەدرخان بوویە میریٚ بوٚتان. ئەوی میرگەها خوٚ ژ بن دەستیٚ ئوٚسمانیان دەریٚخست, پاشی هیٚدی هیٚدی هزرا کوردستانەکا سەربخوٚ کەتە د سەریٚ وی دا. ئو بژلی میرگەها بوٚتان چ میرگەهیٚت دی ییٚت سەربخوٚ نەبوون, لەورا بەری هەر تشتەکی وی بزاڤ کر تەڤایا کوردان بکەت ئیٚك.. رابوو شاندە پەی مەزنیٚت کوردا ییٚت نیٚزیك و داخواز ژیٚ کر کو ئیٚکەتیەکا تەڤایی د ناڤا خوٚدا چیٚکەن.. ژ وان کەسان ییٚت کو چوینە د ڤیٚ هەڤگرتنا پیروٚز دا, مەحمود بەگ ((خان مەحموود)) بوو.[1]**

**دیارە خان مەحموود ئیٚك بوویە ژ وان میریٚت کوردان ییٚت سەروەریەکا ب هیٚز ل سەر گەلەك دەڤەریٚت کوردسنانیٚ هەی. جەلیلیٚ جەلیل د کتیٚبا خوٚ ((من تاریخ الامارات في الامبراطورية العثمانية)) دا, د بیٚژیت: ((ویٚ دەما ئوٚسمانی یان ب سەروٚکاتی یا حافظ پاشای ئیٚریش برینە سەر بەدرخان بەگیٚ میریٚ جزیرا بوٚتان, د وی دەمی دا بەدرخان بەگ مایە ل بەندا خان مەحموود کو هیٚزیٚت خوٚ بشینیتە هەواریٚ. هیٚزیٚت وی بیست هزار کەس بوون ژ کورد و ئاشووری و ئەرمەنان, لیٚ هیٚزیٚت ترکان ب سەروٚکاتی یا حافظ پاشای شیان بەری هنگی ریٚکیٚ ل هیٚزیٚت خان مەحموود بگرن. خان مەحموود ب هیٚزیٚت خوٚڤە نەشیا ل رووباریٚ دیجلەی**

---

[1] هەر ئەو ژیٚدەر, بپ ٥١=٥٢.

دەرباز ببیت, ژبەرکو ترکان مەخفەرەکا ب هێز دانابوو د ڕێ دا و هێزێت خان مەحموود چەند جاران بزاڤ کر ژ پرێ دەرباز ببن, لێ نەکارین, ژبەرکو تۆپرێژەکا دژوار ل سەر پرێ هەبوو. دیسان هێزێت وی بزاڤ کر کو دوور ژ پرێ, ل جهەکێ دی ژ ڕووباری دەرباز ببن, لێ ژبەر لەهی ییێت ئاڤێت بهارێ, سەتمین. هێزێت وی تالانەکا مەزن دا ژبەرکو چەکێت وان رم و خەنجەر بوون و بەرامبەر تۆپان شەڕ دکرن. پشتی خان مەحموود شکەستی و نەکاری بگەهیتە بەدرخان بەگێ, ئینا ڤەگەڕیا چیایێ ئەرتووس ل ژێری یا گۆلا وانێ. ئو ل وێدەرێ هێزا خۆ ئاڤاکرەڤە.))[1]

## مەحموودێ کورێ وەداعی

د سالا ١٢٣٧مش, بەرامبەر ١٨٢١زا, خودێ کوڕەك دایە وەداعی, ب ڤێ هەلکەفتێ ئەوی هەلبەستەك جوان ب فارسی ل سەر ڕۆژبوونا وی گۆتی یە, بەری بچیتە د ناڤ هەلبەستێ دا ئەڤ هەڤۆکە هاتیە نڤیسین (( در تاريخ عمر فرزند دل بند خود محمود نام انشا كرده شده)).

د هەلبەستێ دا ئەو گەلەکێ شاد و کەیفخۆشە, ژ دل سوپاسیا خودێ دکەت و قەنجی یا وی د گەل کری, ئەڤە ژی چەند مالکێت وەرگێرایی, کو دبێژیت: ((ژ بەحرا غەیبێ, خودێ تەعالا دەرگەهێ هیڤی یا ل من ڤەکر, کوڕەك ب ناڤێ مەحموود دا من, ڕۆژا دای, ڕۆژا ئینیبوو, کو پیرۆزترە ژ عید و نەورۆزا)). د داوی یا هەلبەستێ دا, سالا بوونا وی ب تیپێت ئەبجەدێ ئانی یە, هەروەك دبێژیت:

بسالى رى و غين و لام و با ذال

٧ ٣٠ ١٠٠٠ ٢٠٠

بحمد الله مرا رهبر شد اقبال

---

[1] جلیلی جلیل, من تاريخ الامارات فى الامبراطورية العثمانية.. چاپا عەرەبی, دمشق ١٩٨٧ بپ ١٠١.

هەرچەند هژمارا (٧) بۆ (ز) تێت, نە بۆ (ذ), لێ ددەسنڤیسێ دا هەر (٧) دانایە بەرامبەر (باذال). د تیپێت ئەبجەدێ دا ژی (ذال) دبیتە (٧٠٠) کو, ئەڤە نا کەڤیتە بەر سالا بوونا کوڕێ وی. لێ دبیت وەداعی ژی هەر ب فارسی وەك ( زال ) ب لێڤ کربت و خوێندبت.

هەر وەك دیار, سالا بوونا کوڕێ وەداعی د کەڤیتە دگەل سالا کوشتنا میرێ وی ((شێخی بەگ))دا, دیسان هەروەك وەداعی بخۆ گۆتی, کو پشتی وی خان مەحموود ل شوونا وی بوویە میر. لەورا دوور نینە وەداعی د شرینییێت خان مەحموود دا, ناڤێ کوڕێ خۆ کری یە مەحموود.

د بەرپەڕەکی دا ژ دەسنڤیسێ ئەڤ هەڤۆکا خوارێ هاتی یە: ((آه از فراق محمود الی یوم الموعود)). ئەڤ هەڤۆکە دو رامانان ددەت, یا ئێکێ: دبیت کو وەداعی ژ کوڕێ خۆ دوورکەتبیت, لەوڕا ئاه و حەسرەتا ژ بۆ وی دکشینیت. یا دوییێ: دبیت کو کوڕێ وی مربیت. ئەڤجا مرۆڤ دکاریت پێتر یا دوییێ بپەژرینیت, ژبەرکو فراق و ژێکڤەبوونا وان ((الی یوم الموعود)) ە.

## ژینا وەداعی:

دەمێ مرۆڤی بڤێت ژینا هەلبەستڤانەکێ کەڤن ڤەکوولیت, دڤێت ڤەگەڕیت بۆ ژێدەرێت دیرۆکێ, ئەوێت دیرۆکڤانان نڤیسین, لێ پێتڤی یە وێ پسیارێ ژی بکەین, کا کورد وەك تەڤ گەلێت دی, هەر ڤی ئاوایی ب کار بینن و ب رێ یا دیرۆکڤانان بگەهن راستی یا ژینا هەلبەستڤانێت خۆ یێت کەڤن, یان رێ یەك دی هەیە؟! ب هزرا من, ب ڤێ رێ ئەم ناگەهین مەرەمێت خۆ, ژبەرکو هەم دیرۆکا کوردان کێم هاتی یە نڤیسین, هەم ژی ئەوا هاتی یە نڤیسین چ پویتە نەدایە تۆرە و تۆرەڤانان. ئەگەر دیرۆکڤانان تشتەك ل ڤێرێ وێراهە نڤیسیبت ژی, دیسان شاشییێت مەزن تێدا هەنە و ئەم نکارین وەك ژێدەرێت راست بپەژرینین. لەوڕا ژی, ڤەکۆلەرێت دیرۆکا تۆرەیێ کوردان پتر ژ هەر کەسەکی د کەڤن ئاستەنگ و رێکێت نە سەر لێ دیار, نە بن. ژبەر ڤێ چەندێ ژی دەرگەهەك تنێ بۆ مە ڤەکری دمینت کو ئەم تێڕا بچین ژۆر و تێدا ژینا وان ڤەکۆلین, ئەو ژی هەر بەرکارێ وان بخۆیە.

ل ڤر ژی, د راستا ژینا ڤی هەلبەستڤانی دا, مە چ ژێدەرێت دیرۆکیێ ددەستدا نینن کو تشتەکی ژ ژینا وی دیارکەن. دیسان ئەم دێ هەر ڤەگەڕین بۆبەرکاریێ وی بخۆ و ئەو ئاوریێت وی د هەلبەستێت خۆدا دەستنیشان کرین و دیواریێ خۆ ل سەر ڤی بنیاتی ئاڤاکەین. وەداعی هندەك سال و قەومین د هەلبەستێت خۆدا ئانینە, ب رێکا وان دێ هن کوژیێت نەپەنی د ژینا وی دا دیاربن.

١- د داویا هەلبەستەکا خۆدا کو ب فارسی ڤەهاندی یە ئەڤ دو مالکێت خواریێ هاتینە:

ر ح و زا اما الف

از حساب زیاده میشود

ئەگەر مرۆڤ ل پەی هەژمارا ئەبجەدیێ لێك بدت دێ ئەڤ دیرۆکا خواریێ دەرکەڤیت: (ر) دبییتە ٢٠٠ (ح) دبیتە ٨ (و) دبیتە ٦ (زا) دبیتە ٧ (الف) هزار. هەمی ب هەڤڕا دبنە ١٢٢١م, بەرامبەر ١٨٠٦زا.

٢- سالا ١٢٣٩ مش, برامبەر ١٨٢٣زا د ١٤ێ کانوونا ئێکیێ دا شپی و بارانێت گەلەك بۆش بارینە, شاپ و لەهی ل ئەردی رابووینە. وەداعی هەلبەستەك جوان پێ ڤەهاندی یە, بەری دەست ب هەلبەستیێ بکەت ئەڤ رێزا هانیێ ب فارسی نڤیسی یە, دبێژت ((در ثنای باری تعالی د ئامدن باران در ماه کانون اول, سنه ١٢٣٩)).

٣- هەروەك مە ل سلال گۆتی, هەلبەستەکا دی یا دوور و درێژ ل سەر شۆڕشا ((شێخی بەگ)), میریێ مکسیێ, یا کو دژی ترکان کری نڤیسی یە. د هەلبەستیێ دا وەسا دیار دکەت کو شێخی بەگ سالا ١٢٣٧مش بەرامبەر ١٨٢١زا تێت کوشتن, د داویا هەلبەستیێ دا چارمالکی یەك نڤیسی یە و دیرۆکا مرنا وی ب تیپێت ئەبجەدیێ تێدا دیار کری یە, دبێژت:

یا ڤەنج ئەوە ئەم ڤێ بکەین

ناڤی ل تاریخیێ بدەین

بۆ غەین و ریێ و لام و زەین

کانیێ جهانگێریێ جهان

ل ڤر ((غ)) ١٠٠٠ ((ر)) ٢٠٠ ((ل)) ٣٠ ((ز)) ٧. ١٠٠٠ + ٢٠٠ + ٣٠ + ٧ = ١٢٣٧مش.

٤- هەلبەستەکا دی ب فارسی ل سەر رۆژابوونا کورێ خۆ سالا١٢٣٧مش, بەرامبەر ١٨٢١زا, گۆتی یە, ئەڤ سالا بوونا کورێ وی ژی هەر د کەڤیتە وێ سالا شێخی بەگ هاتیە کوشتن, ئانکو سالا ١٢٣٧مش.

٥- دیسان سالا ١٢٥٦مش, بەرامبەر ١٨٣٩زا, وەداعی هەلبەستەك ب خان مەحموود گۆتی یە.

٦- د هەلبەستەکێ دا, د ڤان هەردو مالکاندا د بێژیت:

**عمـر مـن ڤـێ ئـنـتـهـابۆ, بۆیە نێزیك پـەنـجـهـان**
**من د کونجێ هجر خونخوار و ژ هەجرێ من چ دیت**

دیسان د هەلبەستەکا فارسی دا دبێژیت:

**عمر من نزدیك پنجاهم رسید**
**پنجر تاکی بمانی الـوداع**

ئەز دوێ باوەرێ دامە کو وەداعی ئەڤ هەردو هەلبەستێت هانێ یێت کو تێدا ژیێ وی گهایە پێنجی سالیێ, ل دوڕێت سالا ١٨٤٠ێ نڤیسین. ئەڤجا ئەگەر ٥٠ پێنجی سالا ژ ١٨٤٠ پاڤێژین سالا بۆنا وی دێ کەڤیتە دەور وبەرێت ١٧٩٠زا.

پێتڤی گۆتنێ یە کو وەداعی پاشناڤێ, ئان ناسناڤێ هەلبەستڤانی یە, ناڤێ وی یێ دروست و ناڤێت باب و باپیرێت وی نەهاتن زانین. دیسان جهێ بوونا وی ژی نەخویایە.

## کەلا خۆشەبێ ((خۆشابێ))

وەداعی هەلبەستەکا گەلەك رند و جوان و خشکۆك ب فارسی ل سەر کەلا خۆشابێ گۆتی یە, ب ڤان هەردو مالکان دەسپێك ژێرا دانایە:

**خوشـا آن کس که بیند جای خوشاب**
**خصـوصا قـلـعـەئـی زیبـای خـوشاب**

د هەلبەستێ دا وەسا دیارە کو ئەو حەیرانێ ڤێ کەلایێ بوویە و وەها سالۆخا وێ دکەت هەر وە کو د دنیایێ دا کەلێت ب ڤی رەنگی نینن:

**اگر گردی جهان یکسر بگردم**
**نەبینم موضع همتای خوشاب**

د دومالکی یەکێ دا وەداعی دیرۆکا ئاڤاکرنا وێ نڤیسی یە و گۆتی یە کو سالا ١٣٤سەد و سیە و چارێ مش, هاتیە ئاڤاکرن, هەر وەك ئەو بخۆ دبێژیت:

**همه عالم زد ست او بنا شد (شد)**
**((سنه)) ١٣٤ در مـــأوای خوشاب**

ب راستی چ ژێدەرێت کو ل سەر کەلا خۆشابێ و دیرۆکا وێ نڤیسای ددەست مەدا نە بوون, لەورا ئەم نکارین چ تشتەکی د راستا دیرۆکا ڤێ کەلایێ دا ببێژین, بژلی وان چەند رێزێت ((ئەولیا چەلەبی)) د گەڕا خۆ یا کوردستانێ د سیاحەتنامێ دا گۆتین. ئەڤە ژی کورتی یەکە ژ سالۆخا وی بۆ کەلایێ کری:

((ژبەرکو رووبارێ خۆشابێ د بن کەلایێ دبۆریت, ناڤێ وی دانایە سەر کەلایێ, ناڤێ کەڤن ((ئەرچەکا بلند)) بوویە و ژ بنیاتێ هەکارییێت دەما عەباسیایە, سالا ٨٠٠ کەتیە دەستێ مەحموودی یان, نهۆ ژی هەر پایتەختێ بەگێت مەحموودی یە, سالا ١٠٦٠ ئێك ژ خانان, ناڤێ وی ((سولەیمان زەمان)) بوو, ئەڤ کەلایە پێشێخست, ژ ئالێ رۆهلاتێ کەلایەکا موکوما سولەیمانی لێ چێکر

و بەرێت تەمەت فیلەکی تێدا دانە کار, ئەو بەر درێژیا وان بیست پیێ نە و درێژ و درێژ دانایینە دناڤا دیواری دا و کوژییێت وان ژێ دەرێخستینە, داکو باشتر خۆ لبەر گوللەتۆپا بگرن, جووت دیوارە و سەرێت وان نخافتیێنە, ئانکو هندی تۆپا لێدەن کار تێ ناکەن. سالا ١٠٦١ دەما محەمەد ئەمینێ کوڕێ شەمسی پاشا ((کەلا)) دۆرپێچ کری, بیست و نەه رۆژا تۆپ لێدان و نەشیا بەرەکی ل سەر بەرەکی بلڤینیت و بێ هیڤی ڤەگەڕیا. د وەلاتێ ئۆسمانی دا وەسا یا بەلاڤبوو کو دەرگەهڤانی یێت کەلان ژ داری چێدکرن و پیستەکێ ئاسنی تێ د هەلکێشا, د شەڕان دا دەما ئاگر د بن ڤان دەرگەهڤانی یا هەلدکرن, دارێ وی د سۆت و ئاسن ژی د بهوژی.. لێ ئەڤ دەرگەهڤانی یا کەلا خۆشابێ هاتیە داڕێتن ژ سێسەد قەتتار پوولاییێ نەخچەوانی و دار تێدا نینە.

کەلا گەلەکا بچووکە و تنێ فەرماندار ((برایم بەگێ مەحموودی)) تێدا دروونیت. هەرچوار دەور و بەرێت وێ هزار و دوسەد پێنگاڤن, د کوژیەکی دا گەرماڤەکا بچووك بۆ بەگی, عمبارا دەخل و دانی, بنبیڤ, جەبلخانە و دەه تۆپێت شاهانە لێنە, عمبارەك هەیە ئاڤا بارانا تێدا تێت داگرتن )).. هتد.[1]

## کار و ژیارا وەداعی

پڕانی یا هەلبەستڤانێت کورد ژینا خۆ د مزگەفتاندا بۆراندی یە و کارێ وان ژی هەر د مزگەفتاندا بوویە, یان دەرسدار بووینە و پێشنڤێژی کرینە, یان ژی تنێ کارێ وان پێشنڤێژی بوویە, دەبارا وان ژی ژ گوندی یان, یان ژ خەلکێ باژێری هاتی یە, چمکی ژیارا وی چاخی یا مەلان ب ڤی رەنگی بوویە. لێ هەلبەستڤانێ مە وەداعی کارەك دن کری یە! ئەو کار ژی دەبیری و کاتبی بوویە, ئانکو ب درێژیا ژینا خۆ (دەبیرێ) میرێت مکسێ بوویە. وەسا دیارە کو د تۆلازی و لاوینیا خۆدا کاتبێ میرێ مکسێ ((شێخی بەگ)) بوویە, پشتی ئەو تێت کوشتن, هەر ئەو کار بۆ میر ((خان مەحموود)) ژی کری یە.. لێ پسیار ئەوە کا

---

[1] سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەبی, کورد لە مێژۆی دراوسێکانیدا. وەرگێڕان: سەعید ناکام... چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد, بەغدا ١٩٧٩. رۆپەل ٣١٥-٣١٦.

وەداعی هەتا داویا عەمرێ خۆ مایە ل سەر ڤی کاری؟! ئەڤ بەرسڤە ژی د هندور هەلبەستێت وی دا بۆ مە خویا دبیت. د هەلبەستەکێ دا وەداعی ب ئاشکەرا دبێژیت, کو ئەڤە پیری هات و دڤێت ڤی کاری بهێلم و ئەو ژیێ مایی د ری یا خۆدێ دا بمەزێخم, دبێژیت:

**ئەی دلۆ ڤێ هات پیـری**

**شەرم نەهن جارەك حەیاکە**

**بـەس نـەهـن ئێدی دەبیری**

**کـاتـبـی کـارەك هــلاکــه**

هەر د وێ هەلبەستێ دا ددەت خویاکرن کو ئەو گەلەکێ پێشەمانە و ئەو عەمر و ژیێ وی یێ بەرێ هەمی ب خۆڕایی و بەلاش چوویە, وی دڤێت ژ ڤێ رێکێ لادەت و هەو کاروبارێ میران ب رێڤە ببەت, ژ خۆڕا رێ یەکا دی هەلبژێریت, ئەو ژی رێ یا خودێ و تۆبێ و تەریقەتێ یە:

**تــەرك دنـیـا و هـــەوەس کــە**

**ژ خـزمــەتـا میران تو بەس کە**

**قەصد یەك صاحب نەفەس کە**

**بـەلـکــو دەردێ تــە دەواکـــە**

د وی چاخی دا تۆبەکرن پڕانی ل سەر دەستێ شێخەکێ تەریقەتێ بوویە, لەورا وی ژی شێخەك ژ خۆڕا هەلبژاتی یە, ئەو شێخ ژی هەر وەك ئەو ناڤێ وی د هەلبەستێ دا تینیت ((سەیید گاها)) یە, دبێژیت:

**هـیـڤی یا من پـادشـاهــا**

**سەییدێ سەممی یە گاها**

ل ڤیرێ بۆ مە خۆیابۆ کو وەداعی د هەلبەستێت خۆدا ب ئاشکرایی بڕیار دایە کارێ خۆ بهێلیت و ژ بۆ دینی و رۆژا ئاخرەتێ کار بکەت, لێ نە یا خۆیایە کا وی بڕیارا خۆ ب جە ئانی یە یان نە؟ بەرسڤا ڤێ دێ هێلین بۆ پاشەڕۆژێ.

## سەید طاها ((طاها)) کییە؟

وەداعی جارنا ناڤێ شێخێ خوّ ((طاها)) ئانی یە, جارنا ژی ((طاهر)) کو هەردو ژی ئێکن. هەر وەك دیار و ئاشکرایە, ئەڤ (سەید تاها)یە, هەر ((شێخ تاهایێ نەهری, شەمدینی یە, بابێ شێخ عبید الله یێ نەهری.. ئێك ژ خەلیفەیێت مەولانا خالدێ نەقشەبەندی بوویە, سالا ١٢٦٤ك بەرامبەر ١٨٤٧زا یێ ساخ بوویە.[1]

وەداعی چەند جاران ناڤێ سەیدطاهای د هەلبەستێت خوّدا ئانی یە, هەلبەستەك ژی ب فارسی تەڤدا ل سەر وی گوّتی یە, بەراهییێ ئەڤ گوّتنە نڤیسیە: ((در مدح مولانا قدس سره العزیز)) د هەر دومالکی یەکێ دا ناڤێ وی جاری بوویە. د دەسپێکا هەلبەستێ دا دبێژیت:

**چشم من در انتظاری راه سید طاهر است**
**شێخ بهاء نقشبندی شاه سید طاهر است**

هەژی گوّتنێ یە, کو وەداعی دبەرپەرەکی د ناڤا دەسنڤیسێ دا, سێ دومالکی ب فارسی ڤەهاندینە, تێدا بەحسێ سەید طاهای کری یە و ناڤێت سێ کورێت وی ئانینە, ئەوژی ئەڤەنە: علاء الدین, عبید الله و محمود. دبیژیت:

**بمخدومی که نور چشم ماها**
**دوری یکتا شهاب الدین طه**
**مکمل مرشد آن پیر رهبر**
**نگنجد شرح وصفش درج دفتر**
**گرامی داست سه (٣) فرزند مولود**
**علاء الدین عبید الله محمود**

[1] بابا مردوخ روحانی, تاریخ مشاهیر کورد, طهران ١٣٧١ش ج٣ ص ٥٦٠.

ئەڤ پارچە هەلبەستا هە بۆ مە خویا دکەت کو شێخێ وەداعی سەید طاها, بابێ شێخ عبید الله یێ نێری یە. نێریێ, ((نهری)) گوندەکە دکەڤیتە ژێریا گۆلا وانێ. دیسان هەژی گۆتنێ یە ئەحمەدێ خانی د چەرخێ ١٧دا, هزرا نەتەوەیی د قالبەکێ فەلسەفی دا دارێت, پشتی وی ب دەمەك دوور و درێژ شێخ عبید اللەیێ نێری ئێخستە دقالبەکێ شورەشگێری و پراکتیکدا.[1]

## هەلبەستڤانیا وەداعی

وەداعی ئێکە ژ وان هەلبەستڤانێت کلاسیکێت کورد یێت گەلەك شەهرەزا و تێهەیی د هەلبەستێ دا, دەما مرۆڤ بەرکارێ وی دخوونیت, بها و نرخێ وی یێ مەزن خۆیا دبیت. د هەلبەستا فارسی دا هندی بێژی شەهرەزا و دەستهەل بوویە, د بازا هەلبەستڤانێت مەزنێت فارس دایە, ئەگەر بێت و دیوانا وی یا فارسی بکەڤیتە دەستێت خودانێت وی ئەزمانی, مسۆگەر وەداعی دێ د تۆرەیا فارسی دا بیتە ئێك ژ کەنکەنێت ناڤدار. پێتر ژ شێست هەلبەستێت فارسی د دیوانا وی دا هەنە, چەند غەزەلێت جامی و حافظ و هن غەزەلێت دی یێت ناڤێت خودانان نەهاتین, تەخمیس کرینە. دیسان هەلبەستەکا هەلبەستڤانێ کوردێ مەزن پەرتوییێ هەکاری کو ب فارسی نڤیسی یە, تەخمیس کری یە.

ب ئەزمانێ کوردی ژی ٣٦ سیه و شەش هەلبەست د دیوانا وی دا هەنە. ئەڤ سیه و شەش هەلبەستە دێ هەرهەبۆنێ دەنە وی و دیسان دێ بیتە ئێك ژ

---

[1] . شێخ عبیداللەیێ کورێ شێخ طاهر, خەلکێ وان گوندانە ئەوێت د کەڤن ژێریا گۆلا ((وانێ)). سالا ١٨٨٠ ب سەرهلدانەکێ رابوو, ناڤێ خۆ, دانا (مەلکێ کوردستانێ), سەرڤەگێریا کریار و ئۆپەراسیۆنێت بەرفرەه کر, ژ تورکیا بو هندرێ وەلاتێ فارس. باژێرێ ئۆرمی یێ دورپێچ کر و سابلاغ و میاندوب ئێخستن بن دەستێ خو و گەف کرن کو مراغێ ژی بگریت. پشتی هنگی ژبەر لێکەڤتن و ب هەڤچۆنێت ئەشیرەتان د ناڤبەرا هەڤدودا, هێزێت وی ژێك بەلاڤەبوون و نەشیا ئێریشێ بکەتە تەبرێزێ. ئو پاشی د تەباخا سالا ١٨٨١ێ هێزێت ترکان شێخ عبید الله ئێخسیر کر و برە ستەمبولێ, ل وێرێ ژی نەفی کرە مەکەهێ و سالا ١٨٨٣ ل مەکەهێ چو بەر دلوڤانیا خودێ. (د. ولید حمدی, الکرد و کردستان في الوثائق البریطانیة, بپ ٢٩٩.)

ستێرێت گەش د ئەسمانێ تۆرەیێ کوردی دا, ئەگەر هاتبا دیوانا وی تەڤ ب کوردی با, دا بەرپەرەکێ نوو د ئەدەبێ کوردی دا ڤەبیت.

هەلبەستا وەداعی گەلەکا رەهوان و نازکە ب کوردی یەکا سڤك و خشکۆك ڤەهاندی یە, ب ئەزمانەکێ زەلال, هەر کەس دکاریت تێ بگەهیت, ئانکو ئەزمانێ وی ئەزمانێ گەلە.. لێ دگەل ڤێ سڤکیێ و نازکیێ شکل و وێنە و نەپەنییێت کوور د شعرا وی دا خۆیانە.. هندێ شەهرەزابوویە د هەلبەستڤەهاندنێ دا بێ خۆ وەستاندن و کوتەکی ژ خۆ کرن هەلبەست داڕێتی یە, ئەو دبازا ئەحمەدێ خانی و پەرتوییێ هەکاری و سیاهپۆش دایە.

د گەلەك هەلبەستێت خۆدا ل سەر ڕێچا فەقیێ تەیران و مەلایێ جزیری چوویە, ئانکو نژنین و شکلێ هەلبەستا وان د شعرا وی دا دیارە.. لێ د ناڤەڕۆکێ دا ئەوی سەمتەکا دی هەلبژاتی یە.. مژارەکا نوو و ناڤەڕۆکەکا نوو. وی د لاوینی یا خۆدا گەلەك هەلبەستێت خۆ ل سەر دەستودار و کاودانێت وی چاخی نڤیسی نە. ئەو پتر ب کاروبارێت دنیاییێ ڤە مژوول بوویە, ئێکەمین شاعرە رووداتێت سەرهلدانەکا کوردا د هەلبەستەکا خۆدا تۆڤچین کرین, هند پویتە نەدایە کاروبارێت دینی, ئەز د وێ باوەرێ دامە, کو پرانی یا هەلبەستێت وی یێت دینی د پیراتییێ دا نڤیسینە, ئانکو پشتی تەریقەتا نەقشەبەندی وەرگرتی.

وەداعی سەنگ و مەزنیا خۆ یا هەلبەستڤانییێ زانی یە, هزرکری یە ئەگەر گەلێ وی پویتە و بهاییێ بدەت هەلبەستا وی و بخوونیت, ئەگەر هەلبەستا وی ل جەم میری بهێت پەژراندن و ل کۆچك و دیوانان بێت خواندن و گوهداریکرن, هنگی ئەو دێ بیتە ئێك ژ هەلبەستڤانێت ناڤدار و هەلبەستا وی ژی دێ کەڤیتە ڕێزێت ئێکێ د دنیایا شعرێ دا, هەروەك دبێژیت:

**نـەظم و ئەشعارێ وەداعی گەر ببت مەقبوول میر**
**دێ د ئەقلیمێ جهان, شعرێ مە دێ مەشهوور بی**

لێ د یاره ئەڤ داخواز و هیڤی ییێت وی ب جه نه هاتینه. د هەلبەستەکا خۆدا ئەو وەسا ددەت خۆیاکرن کو زانینێ، قەلەمی و شعرێ بهایێ وان نەمایه و بازار یێ کەسادە. ب دروستی وی ژی ئەو دەرد کشاندی یه یێ ئەحمەدێ خانی بەری وی کشاندی.. وەسا دیاره نه میر، نه ژی گەل، کەس پویتەی نا دەتە زانینێ، دبێژیت:

**بـێ رەواجـه ڤـی زەمـانـی مـەعـریـفـەت**
**بێ گۆمان بێ قەدره ئێدی علم و خەت**

**سەعید دێرەشی**
**٢٠٠١/٦/٢٠ ئەلمانیا**
**Nuess**

هو المستعان وعليه التكلان

دیـوان وداعـــی رحـــمه الله

(١)

غەما عشقێ عەجەب صـوٚتم

ژ فـەرقـێ سـەر حـەتـا پـێ دا

خـەدەنگ ئاڤێتـە جانێ مـن

بـەلـێ سـەر تـیر وەمان تێدا

ژ بـــەر تـــیـــران و مــــزراقـــان

چ کـوشـــتن کــر ل عوششاقـان

عـەجەب بێ رەحمە ئەو خـاقان

کــو ئـــەم هـــشــتــن د هــجـرێدا

د هـجـرێ جان بدەردا مـه

هـزار ئـاخ و کـەســەر دا مه

خوزی جارەك خەبـەر دا مه

د بەحسێ لگف و رەحمێدا

دسوٚژم شبهی پەروانێ

ل بەر شەمعا شەبستانێ

بوویيم تەشبیهێ بریانێ

ژ دەست نورا د شەمعێدا

مـدام لـەو بیٚ قرارم ئـەز
وەکـی مـەجنوونٍ (لا یعقل)
ژ لەیلیٚ ڤەگ خـەبـەر ناییٚ
مـە دل مـایە د بـەنـدیٚدا

مـە نینن ڤەگ کـەس و یارەك
ببـن ئـاگــەھ ل حـالـیٚ من
ژ بوٚ من هـەر بەسە جارەك
ببـیـنـم ئـەز د ســالـیٚـدا

دلـوٚ مـزگـیـنٍ مـن ئـیروٚ
کو خوندکاریٚ مە دیٚ بیٚتن
صـەبا ئـیـروٚ خـەبـەر ئانی
وە مزگـیـنـی ژ باخویٚدا

چ غـەم گـەر صوٚفی ئنکاربت
نـزانـیـت نـوکتـەیـا عـشقیٚ
وەداعی بەلکو دیٚ حەل کەت
مـعـەمـمـاییٚ د عـشـقـیٚدا

**(٢)**

**لوگفا تەیە زێدەتر ژ غایەت**

**رەحما تە ژ بو نهن[١] نهایەت**

**عوصصات و بەد و گوناهکارم [٢]**

**هەم پیشِ تو ئاوەرەم شکایەت**

**ناڤێ منە عاصییێ گونەهکار**

**ئسمێ تەیە صاحب الهدایەت**

**غەففارِ تویی ببەخشی جرمم**

**ئەز هیڤی دکەم بکەی عنایەت**

**یا رەب ب شەرافەتا نەبی کەی**

**یا رەب ب قەدەر جوملەهی ئایەت**

**جرم و گونەهێدِ من بغوفران**

**عەفوا تەیە بۆ بەدان کفایەت**

**مسکینِ وەداعییێ گرانبار**

**یا رەب ب تە یە ئەوی وقایەت**

---

[١] . نه خویایه کا هەلبەستڤانی (نهن) بلێڤ کری یە, یان (نەهن), د رەوشەکا وەهادا هەردو دروستن, لێ مە (نهن) نڤیسی یە.

[٢] . د لاتینیدا هۆسا تێت خاند: Gunahikarim

(٣)

نازکا من مەستە ئیرۆ قەصدِ خەمماری دکەت
یوسفیٚ حوسنا غەریبە گەرم بازاری[1] دکەت

گوگی یا تبعەت شەکەر ئیرۆ ل خەرگاهیٚ مە دی
دیٚ فداکەم جان و دل چاغیٚ کو رەفتاری دکەت

ئاورن یا رەب نزانم یانە تیر و خەنجەرن
هەر پەیاپەی تێنە من مەقتولِ مووکاری دکەت

موحبەتا ڤیٚ نازەنینیٚ سۆتمە سەر تا قەدەم
هێژ وەکی باران خەدەنگان ویٚ ل دل جاری دکەت

عاشقیٚ صادق ئەزم ئیرۆ د بەندا موحبەتیٚ
لیٚ ژ بۆ من هەر دەما دەم قەهر و ئازاری دکەت

ڤیٚ ب ئەبروویان دو تیر ئیرۆ ل مێلاکا م دان
عشق یا رەب ئاگرە پرسۆزە دشواری دکەت

دارویێ دەردیٚ وەداعی تو ژ وان لەعلان ببەخش
ما د کونجیٚ فرقەتێدا وی ژ مێژ زاری دکەت

---

[1] رێزبەندا (قافیا) ڤیٚ هەلبەستیٚ ب (ری) داوی دبیت, مرۆڤ دکاریت (ڕیٚ) ژی بخوونت.

(٤)

یـا حـەبیبـە الله رەسوولێ خالقێ فەرد و ئەحەد
تـو شـەفیعـێ عـاصیـانی پێشِ قەییومێ صەمەد
مـذنـب و عـاصـی ئـەزم جـرمێدِ من زێدە ژ حەد
شـەرمسـار و رووسیـاهـم پێشِ تە حەتتا ئەبەد
تو ژ فەضلا خوە مەکە مەحرووم گونەهکارانِ بەد

مـن ژ رەحـما خـوە مەکە مەحرووم ئەی پەروەردگـار
پێش تـە یـا رەب دزانـم رووسـیـاهـم شـەرمسـار
یـا ئـیـلاهـی مـن عـەفووکـە تـو ژ ژەنـبـێ بێ شـمـار
مـن نـهـن عـەون و پـەنـاهـەك غـەیری تە ئەی کـردگـار
فاعـف عـنـي یـــا الـهـي لـيـس للـژنـب عـــدد

یا شــفـیع الـمذنـبـین اشفـع لـنـا عـنـد الإلـــه
تــو د فــریـادم وەرە وەقــتــێ د وی حـــالــێ تــبـاه
رۆژ و شـــەب دائـم دنـــالـم هــەر دکـەم ئـەفـغـان وئاە
تو ب حەققێ فەضل و ئحسانا خـوە کە ئەی پادشاە
مــن عــەفــووکــە تــو د ڤــێ رۆژا دلـەرزیـتـن جەسەد

ئـەز دزانـم پـر خـەطـائـێ من هــەنە یوم الحـساب
دێ ل سووچێ من گونەهکاری ببن پرس و خـطـاب
قـەت نـزانـم پـێـش تە یا رەب چ بێژم ئەز جەواب
تـو عـەلـیـمـی پـێ دزانـی جـوملە ئەفعالم خراب
ئـایــەتـێ (( لا تـقـنطوا )) ئایەد بفریادم رەســەد

**یا ئیلاهی پر گونەهکارم میانێ مـؤمنـان**
**دێ چ بت ئەنجامێ کارێ من فەقیرێ نـاتوان**
**وەی ژ هەولا ئاگری وە للاه دلەرزم بێ گومان**
**تۆبەکە جارەك وەداعی پێش رەببێ موستەعان**
**فەخرِ عالەم دا دحەشرێ دا ژ بۆ من بت مەدەد**

(٥)

ئاتەشێ دۆزەخ كو ژێ تێتن صەدا (هل من مزيد)
بێ گومان ئەو نارێ هجرا تە دسوژت من شەديد

(جنة الفردوس) عالى خولدێ كەوسەر سەلسەبيل
وەصلِ ديدارا تەيە هەر كەس كو وان دو شەب مەديد

ئەز دبينم هەر كەسێ بوون مەحرەمێ بەزم وصال
ئەز تنێ ئيرۆكە مەحرووم ژ ديدارێ بەعيد

بەس ب هجرێ من بسوژە رەحم و ئنصافێ بكە
ئەز ب دينا تە دسالێ قانعم با هەر وەعيد

بەس ب ئومميدا وصالێ من بگێرە بێ قرار
مام د كونجێ فرقەتێدا سوتم ئەز كرمە قەديد

تاقەت و قووەت نەما من, بوومە شبهەتێ هلال
بارێ هجرێ دێ حەلينت بكەڤتە سەر كووهەك حديد

عومرێ من ڤێ ئنتها بوو، بوويە نێزيك پەنجهان
من د كونجێ هجرِ خوونخوار و ژ چەرخێ من چ ديد

ملك جان بێ ئابى وەصلەت حوورِ مايە تەشنەلەب
ژئاڤێد چاڤ و هێسترێد من لالەيێ گول بەردەميد

چەرخ كەچ رەفتارە راحەت ئەم نە هێلان جارەكێ
ئاخ و ئۆخێن من ژ دل تێن ئاه (الى يوم الوعيد)

ئەو فەلەك كۆنە نەيارە, كرمە زندانا غەمان
دەر ل من موحكەم ببەست و بر ژ دەستێ من كليد

گەر نە وەصلا تە ميەسسەربى ژ بۆ من فەرزە مەرگ
حەق تەعالا عالمە ئاخر ب حالێ من شەهيد

نابتن ئمكان ژ بو مە حفظ ئەز تيرێ قەضا
هەم ب پايێ تێن وەكى تێژان دەرۆنێ دل حەديد

حكمەت و سررێ ئلاهى كەس نەشێت ژێ دەت خەبەر
هەر ئەزەل گێڕان شەقى هندى نڤيسينە سەعيد

جوملە عالەم راحەت و خۆشنوودن ئيرۆ كامران
دەرد و غەم رۆژا ئەزەل ڤێرا وەداعى ئافريد

هەر عەبابێ ئاسمانان نازلى ئەرضان ببى
دێ بكەن ئەلبەتە پرسا مەسكەنێ عەبد الحەميد

(٦)

صەبا ئیرۆ ل ریحانێ کرە یەغما پەریشان کر
رەڤا دیسا ژ جانێ من قرار و صەبر و تالان کر
ژ بەختێ خوە دکەم شەکوا دلێ من پڕ ب کۆڤان کر
دگەل من بێ نەوایی هەر چ کر وان زلف و خالان کر
ب ئەبروویان ئشارەت دا مە دل فەریاد و ئەفغان کر

ستێرا سەعدێ طالع بوو دەما فکریمە کەیوانێ
نقاب ئاڤێت ژ بەر دێمی ب مەستی هاتە سەیرانێ
دو زلفێ عەنبەر ئەفشانن کنارێ خال و نیشانێ
دەما سەلوا جوان مەشیا نەزەر دا من ژ ئەیوانێ
برینداریێ دو سەرتیران ب دیدارا خوە دەرمان کر

گهوافا گەردەنا جانان ئەگەر جارەك زیارەت کەم
ژ ملك و مالێ دنیایێ بەسە بۆ من تجارەت کەم
ژ چاڤێ نێرگسا شەهلا نەشێم ئێدی عبارەت کەم
مە دل دا دەستێ مەهروویان دزانم دێ خوسارەت کەم
دلێ بێ صەبرێ من ئیرۆ ل رەفتارا خوە حەیران کر

دلۆ مزگینێ من ئیرۆ بهارا تازە ئەلوان هات
ژ رەنگێ سۆر و زەر خەملی م دی بەدرەك د سەیوان هات
ژ جامێ دا مە فنجانەك ب لەززەت ئابێ حەیوان هات
چ سولگانەك نەڤهر من دە ژ بۆ من ڤێ ب ئحسان هات
ئەزەل یا رەب ئەڤینا تە ل تەختێ قەلبی خاقان کر

نـگـاهـەك ڤـیٚ ب ئـەبروویان ئەوا ئاهوو بەصـــەر دا من
چ شیرین گهرفەیین یا رەب کـو جارەك ڤیٚ نەڤهــر دا من
دبیٚـژی شـام و مـصــر و مـلـكیٚ ئقلیمیٚ تەتــەر دا من
شـوكـردارم صـەبا مــزگینـی یـەك ئیرۆ سـەحـــەر دا من
وەداعــی بـرمـە دیــوانــیٚ د گـەل مـن لگف و ئحسان کر

### (٧)

### ((مخمس))

بلبلا ئیرۆ ژ بۆ من بینە مزگینا بهار
رەش ببن ئەو مێرگ و چیمەن خۆش ببن ئەو مەرغزار
خەستەئێ تیرا فراقم دائما دەر ئنتظار
خۆزییا چێبا ژبۆ من جارەکێ بووس و کنار
خوون دبارم دئنتظارم دلفگارم بێ قرار

صەد مخابن چوو ژ دەست من غونچەیا باغێ فەراز
سۆتمە نارێ فراقێ، ئاگرێ سۆز و گوداز
هەر وەکی مەحمودم ئیرۆ سۆهتییێ حوسنا ئەیاز
پێتە ئاگر من دسۆژت هەم حەقیقەت هەم مەجاز
خوون دبارم دئنتظارم دلفگارم بێ قرار

بەس بصۆژە ئەی دلۆ ڤێ پەردەیا فکرا خیال
خەستەئێ تیرا فراقم تەشنەئێ جاما وصال
گەر ببینم جارەکێ ڤێ نازکا ئەبروو هلال
من بەسە هەر دێ فدی کەم زێدە زێر و ملك و مال
خوون دبارم دئنتظارم دلفگارم بێ قرار

مام د کونجێ فرقەتێدا سۆتی جانێ من تەمام
ئەی صەبا جارەك هەرە وێ ئاستانا خۆش مەقام
تو ژ پێ من وە پەیاپەی بێژە لێ بن سەد سەلام
پاش حضورا خەمرەڤینا نازکا شیرین کەلام
خوون دبارم دئنتظارم دلفگارم بێ قرار

**کوشتمە ئەز ئاورێد ڤێ نازکا ئەبروو کەمان**
**کەرکرن مێلاك و جەرگم ئافەتا دەور و زەمان**
**هوون ڤەحێل کەن من گەلۆ یار و بران و هەمدەمان**
**سۆهتییۆ ژارۆ وەداعی موونسێ دەرد و غەمان**
**خوون دبارم دئنتظارم دلفگارم بێ قرار**

(٨)

عـەزيـزى و شـيـريـنـيـيـا سيم و زەڕ
سەبەب مەسكەنیٚ وان دەرۆنیٚ حەجەر

ب طەور و كولنگ و ب ئالاتیٚ تـيـز
شەياطين ژ وان ئاهەنان بەر حەزەر

ژ سـەنـگێد[1] خـارا[2] وە تينـن بدەر
كو عالـەم حـەمـى ژیٚ ببن بەهرەوەر

دەما تێتە تەحصيل و مەوجود بى
مـوهـمـم و ئەزيـيەت دبن ئەو قەدەر

دكەفتە ددەست رووڤى يەك ژى رەمۆن
د سـەنـگـیٚ دخـارا قـەوى سـەختِ تەر

درەمـدارِ دنـيـا بـەخـيـلـن تـەمـەع
ژ دەست وان يەكى پـارە نا ئێتە دەر

كەريمى ب دلتەنگى دەستن ژ مـال
پـەريـشـان ئـەحـوالِ بـیٚ بال و پەر

دو رۆژان خۆشى كیٚ ژ ڤـیٚ دەوریٚ دى
د پـێـرا نـە دى دەرد و غـەم سەد كەدەر

---

[1] . سەنگ: بەر

[2] . خارا: حجر الغرانيت.

نـهـن ئـەهـلـێ عرفان صاحب کەمال
ئەگەر ڤێ دنێ تێك بدەی سـەر بسەر

کعێلێد بێ زینِ پشت لێ کولن
قوماشێدِ ئارمیشِ کورتانێ خەر

ژکـۆران دکـەن خـەلقِ پرسا ری یان
قە ناکەن سوال ژ ئازمایێ[1] ســەفەر

ژ بـۆ عـالـمـان قـەت نەمایە رەواج
دکەن ئەو ژبوونا نەکێرا کەسەر

ئەگەر یەکسەرێ موو تە طالع هەبی
بـلانـێ نـەبیـتـن تـە سێصەد هونەر

دوڕن پەند و شیرەت وەلـێ نـا بهن
نەصیحەت نها ناکەن ئێدی ئەسەر

مە عومرێ خو بووراند ب نادانیێ
ل با مە نەکر فەرق شام و سەحەر

فـەلـەك یـار مۆنانە حاصل کـەلام
نەڤێت ئێ خودان دانش و نامەر

وەداعی شکایەت ژ چەرخێ بـەسـە
نەیـارە فـەلـەك فـایـدە نـادەن خەبەر

---

[1] . ئازما: شەهرەزا، رێزان.

(٩)

غـەریـبـم بێ کەس و بێ مەسکەن و وار
پـەریـشـان رۆژگـار ئـاشـوفـتـە بیـمـار

مـە ژەهـرێ دی ژ دەهـرێ بـو خـوە بـەهـرێ
فەلـەك دوونـبـەختِ نا مەوزوون مە خوونخوار

ل من سێ دەرد ئیرۆ بوونە صـادر
غەریبی، پیری و یا دی غەمێ یار

غـەریـبـی، پـیـری، هـەردو گـەر چ زۆرن
غەمێ یار بەلکو سەد جار زێدە دشوار

هـەمـی دەردان هـەیـە بۆڕا علاجەك
عـلاجـێ عـاشـقـان دەرمانە دیـدار

دڤـێ دلـکـول وەکـی بلـبـل ژبۆ گول
خودان و دەرد و روو زەر و دلافگار[١]

تە کر فەرمان بدا دەرمانِ ئەی جان
بـکـە ئـحـسـان وەداعـی مـایە ناچار

---

[١] .دل أفگار: خەمگین، دلتەنگ.

(١٠)

شـكـر و پهنـا ژبـۆ خـودێ
عـشق ددل تـهمامـه خهط
غوصصه و غهم ژ دل برن
ذەوق مەی و مەدامه خەط

گـەر چ مـه ديـت پـر زەجــر
ظولمەتِ شـەب كونج هەجـر
طـالــع بــوو ل مـــن فـەجـر
مـن ژ لـەبـان كـەلامه خەط

عـەيـش و نـشـاط و عـشـرەتـه
رەقــص و سـەمـاع و لـەززەتـه
يـــارى و كــەيــف و ئـولـفـەته
عەرعەر و خۆش خەرامه خەط

هـنـده مـنـێ ژار و غــەريب
جەور و جەفا دين ژ رەقيب
لـێ ب كـەلامـەكـێ حـەبيب
دل ڤــەكـرى و دا مـه خـەط

نـەظـمِ وەداعـى ئـابـدار
بلبـلـى چـيـمـەنى بـهـار
هـات مـەجالێ وەصلى يار
مـن ژ گـولان مەشامه خەط

(١١)

ئاڤ چاوێدِ مه شین کرنه نەباتاتِ زەرع
مـن نـەمـا ئـاڤرۆ و تەقوا و پرهێزِ وەرع

سەرخۆش و مەستم و مەیخانه مەقامێ منه هەر
خـەلق دکەن پرسێ ژ من مەسئەلەئێ علمِ شەرع

تیرێ هـجـرانێ غـەدارن ل م روو کەر دکەتن
گـەر لـبـاسـێ تـە دبـەربیتِ ژ پۆلادِ دەرع

عـاشـقـێ ژار دڤـێ تـابعِ گـوهـداری حەبیب
نه تەخۆند مەسئەلەیا تابعێ ئەصلینه فەرع

غەمزەیەك دا مه وەداعی ئەڤێ ئاهوو بەصەرێ
بوومه پـابەنـدێ جەمالێ و هەسەودا و صەرع

**(١٢)**

**ئەی دریغا نەوجەوانی چوو تەلەف**

**جـائـنـي الشـيـب وقعت في الضعف**

**سـۆتــمـــه نـــارێ فـــراقـێ دێ چ بـــت**

**گـەر ژ وان لـەعلان تو دەرمان كەی ب خەف**

**مـن ژ دلـبـەر قـەط نـەدی رۆژەك وەفا**

**هەر خەدەنگ و ئاوران كرمە هەدەف**

**ما تنێ ئەز مەست و شەیدامە جنوون**

**سـەد وەكـی من ڤێ دنالن هەر طەرەف**

**من د هجر و دووریێ بۆراندی عومر**

**لـێ رەقـیبـان شـادمان گرتینە صەف**

**ڤـێ ژ مێژڤە عاشقان بۆ یەك نگاه[١]**

**دئنتظارن نەقدێ جانێ وان دكەف**

**عــاشــقــان زانـیـنــە عـلـمـێ مەعنەوی**

**كان چی یە ئاوازِ ساز و چەنگ و دەف**

**جامێ عشقێ دەرخورێ[٢] هەر كەس نهن**

**ئــەی وەداعـی دا نـەدی ژێ لاق و كـــەف**

---

[١] . نگاه: نێرین, سەحكرن.

[٢] . دەرخور: هەژی, لایق.

(١٣)

جارەك مەناله ئـەی دل
ڤـێ هاتِ خۆش بهارەك
رسـتـن ژنووڤە سۆرگول
بـلـبـل جەمـان هزارەك

ب ئاواز خۆش دخـوینن
د گـولـشــەنــان دمـیـنـن
هـەر چـەنـدِ دل بـریـنـن
دیـنـە ژ بـۆ خـوه یارەك

بـلـبـل چ ئەهلِ حــالن
مـشـتـاق وەردێ ئـالن
ئـەڤ واصـلـێ وصالن
تــە دل چ بوویە نارەك

شـابوون ب یـارِ هـەر کەس
بـوون مـەرغزار[١] ئـەطـلـەس
ژئـەفـغـان و نـالـیـان بەس
کەیفا خوه خۆشکە جارەك

---

[١] . مەرغزار: مێرگ.

ئـیـرۆیــه وەقـــتِ فــرصـــەت
شاهی وو عەیش و عشرەت
دووری و دەردِ مــحـــنـــەت
بـــۆری مـــەکـــە فـــکـــارەك

هاتی ب خێر صەبـایه
مـزگـیــن ژ بـۆ مه دایه
بەختێ مه بوو خویایه
هات بۆ تەڕا بتەدارەك

پێلەك مه دیتِ هـجـران
بئەفغان و ناله گـریـان
لـــێ عـاقبەت د پایان
چـێبوو صەبر قرارەك

زانــی کـــو دەردمـــەنـــدن
شاندی و ئەم ڤەخوەنـدن
شـیـریـن کـەلام قـەنـدن
دامــە ژ مـــەیـــێ خومارەك

هـجـرێ وەداعـــیـــێ ژار
هـــەر چـەند کری گرفتار
شـــادان کـــرم ب دیـــدار
ب حسنا خوەیا مبـارەك

(١٤)

ئیـرۆ د وەقتـیٚ سـەحـەریٚ
من دیتِ ئەو رەعنا شـەپال
هـاتـە شـبـاکـا پـەنجەریٚ
سـورمـە ددا چـاوێد غەزال

چـاڤـێـد بــەنـگـی و غـوراب
صـۆتـم بـراشـتـم بیٚ حسـاب
من جەرگ و دل بوونە کـەبـاب
خـوزیـا میـەسسـەربـا وصال

دەردا ژ وان تــیــر ئــاوپان
ئەبرووکەمان شـیرین سڕان
فەریاد ژ دەستیٚ ئەسمەران
ئـەفـغـان ژ ئەبروویێ هلال

بـلـبـل ژ عـشـقـیٚ دیـن دبوو
غونچە صفەت دل خوین دبوو
ژ حوببا گولێد رەنگـیـن دبـوو
ئـاخـر ئــەژی بـوومــە هەڤال

بـوومـە هـەڤـالـیٚ بلبلان
گـەڕهـام مـثـالیٚ دلکولان
مـوشـتـاقِ دیدارا گولان
لەب تەشـنـەئیٚ ئاڤا زەلال

لەب تەشنەئیٚ دیدارم ئەز
ژ بەر غەمزەیان بیمارم ئەز
پر عاشقیٚ خوونخوارم ئەز
رۆژن ل من تەشبیهی سال

سال و هەییڤ و رۆژ و شەو[١]
مـن نـە تـەبێت تێتن نە خەو
کـرمـە مـثـالـیٚ مـاهِ نەو
حـوسـنـا منەززەه بیٚ مثال

مە ژ دەستِ حوسنا دلبەریٚ
ئەبروو کەمان لەب شەکەریٚ
ئـاگـر گـەهـایـە جـەگـەریٚ
پـێـت ڤێکەتی بوویە شەمال

حـوبـا تـە صۆتم دەم بدەم
بەربوو سـەری هـەتـتا قەدەم
دەربـوون ژ دل ئـەفغانِ غەم
لـــەورا وەداعــی مـایــە لال

(١). ددەسنڤیسێدا "شەڤ" هاتییە, لیٚ ژبەرکو رێزبەند ب (ەو) بدویماهی تێت, وەکو "شەو, خەو, نەو" لەوڕا مە ژی "شەو" دانا.

**(١٥)**

**ئیرۆکە صەبا دایە مە مزگینی و جەوابە**
**ئاواز و نەی و ساز و مەییێ نابِ شەرابە**

**عـمرەك مە غەم و دەرد و بەلا دیتە ژ دوور**
**سەر تا قەدەم ئەز سۆتمە ڤێ بوومە کەبابە**

**گــازنـدە ژ ئـەغـیــار و رەقیبان چ بکەم ئەز**
**هەر چی کو دگەل من کر ئەوا چەشم غورابە**

**ئــەز مــســتــەحــەقــێ صـنـفێ زەکاتێمە فەقیرم**
**ببەخشە مە ل حسنا تە کو فەرض بۆ مە لیقایە**

**نــابــم دەمـەکی راحەت و خالی ژ فغانان**
**ژهجرا تەیە من چاڤِ تژی خوون و عەزابە**

**ئەز کوشتییێ عشقێ مە شەهیدێ دو خەدەنگان**
**ڤـێـڕا ب جــەنــازێ مــە وەرە بــۆ تــە ثـەوابە**

## یەك جورعەئێ مەی نۆشی یە ئیرۆکە وەداعی
## لـەورا ژ جـهـان بـێ خـەبـەر و رند و خەراب[1]

[1] . د چاپا بەرلینیٚدا مە گوٚتبوو کو: ((بەرپەڕەك د ناڤ دیوانیٚدا هەیە و د وی بەرپەڕیدا چەند هەڤۆکێت لیٚکدایی هەنە, وەهەیە یا خۆشنڤیسی بیت)), ئەڤ تشتە من گوٚتبوو ژ بەرکو لبا کوٚپی تنێ ددەست مندابوو, د کوٚپییێ دا مروٚڤ هزر دکەت کو ژ دیوانێ یە, لێ پشتی من جارا دوییێ دەسنڤیس دیتی, دیاربوو کو بەرپەڕ وەك (ناڤدەستك) د ناڤ دەسنڤیسیێ دایە, هەم خەت و هەم ژی رەنگێ کاغەزێ ژێك جودانە و دیارە کاغەزا وی بەرپەڕی, نوویە, نە گەلەك کەڤنە. ئەڤجا بێ شك ئەڤ نڤیسینە نە یا وداعی یە. ئەڤا خوارێ ژی دەقا وێ یە, کو پشتی هوٚزانا ژوٚری تیٚت:

**دەســت دای شــیـــــری**
**شـیـرکـیٚـشە وەکی دلیٚرە**
**ئـەوی نـەکـر چ صوبحیٚرە**
**صـاحب نووریٚ عبـدالقادر**
**حەطەب دانی بە وی شیرە**
**صـاحـب نـووری عەبدالقادر**
**شیٚخ ظاهر دبوو ل شەعبانێ**
**هاتبوو مانگا رەمەضانێ**
**مـانـگ نـەدی ل عەزمانی**
**مانگە نە دی ئەو بێ مەجال**
**ظـاهـر نــەبوو قەوسا هلال**
**بچین ژ بابێ شیٚخ بکەین پسیار**
**بـابـێ شـیـرین کردی گوفـتـار**
**بـچـیـن ژ دائێ بـکین پسیار**
**ئـەگــەر شـیٚـخ شیـر دخوە**
**روٚجیی بخوٚن مەکین تەقصیر**
**شـیٚـخ صالحە ئەو پێ خەبیر**

(١٦)

قەوسەك ژ دو ئەبروویان
سەرمەستِ شرینا من
ب زۆرا سەربازوویان
ئاڤێتە برینا من

قەوسەك ژ هلالێ یار
ئاڤێتە دلێ ئەفگار[1]
بر صەبر ژ دل یەكجار
ئەندووە رەڤینا من

ئەندووە غەمێ دووری
بێ كاری یە مەهجووری
وەقتێ خۆشیێ بووری
ئەی دررِ ثەمینا من

هندی تو بكەی زەجرێ
نیشا مە بدەی هەجرێ
رەنجوور ببم بصەبرێ
كێم نا بت ئەڤینا من

هەم شەهد و نەباتی تو
هەم ئابێ حەیاتی تو
هەم بۆ مە نەجاتی تو
ئەی زوهرە جەبینا من

---

(1) . ئەفگار: ب ئێش و ژان, وەستیایی.

من نينه كەس و يارەك
پـرسا مـه بكـەن جارەك
هـەلـكـر, ته د دل نارەك
ئـەى حوور عـەيـينـا من

تــه هــشــتِ وەداعــى ژار
بیٚ موونس و بیٚ غەمخوار
پـرسـا مـه نـەكـر يـەكجار
ئــەى تــاجِ نـگـيـنــا مـن

(١٧)

ئەی دلۆ ڤێ هاتِ پیری
شەرم نهن جارەك حەیاکە
بەس نهن ئێدی دەبیری
کاتبی کارەك هلاکە

کاتبی کارەك چەتینە
تە چ دی بیرا خوە بینە
عاقبەت خێر تێ چو نینە
مە بدەردا, فایدە ناکە

فایدە ناکەت من نەزانی
چوو تەلەف ئەڤ نەوجەوانی
عومرێ پیری ناتەوانی
کی خەریدارە بهاکە

تە چرا هندە گوناه کر
نامەئێد سپی پر سیاه کر
بدەست خوە کارێ خوە تەباه کر
بەر ب دەرگاهێ خودا کە

دێ حەتا کەنگی فضوول بی
هندە پێ نەفسێ مژوول بی
عاقبەت دێ پێ مەلوول بی
خوە ژ دەست نەفسێ رها کە

چەرخی چەند کرنە قەباحەت
کـێ ژ دەورێ دیـتِ راحــەت
کـەس نـە هێلان بێ جەراحەت
دێ ب کـێ را ئـەڤ وەفـاکـە

بەس ب وان جرمان قەلەو بە
تـو ب جـان و دل کـە تـەوبـە
هـێـژ نـە گـەهشتی تە نەوبە
گـریـە و زاری نـهـا کــە

تـو ژ بـۆ میـرێـد مـەعقـوول
هندە سالان بوویی مەشغوول
زێرێ ئەحمەر چوو بهای پوول
دێ تـەمـیـز کە، ژێك جدا کە

تــەركِ دنــیــا و هــەوەس کـە
ژ خـزمـەتـا مـیران تو بەس کە
قەصدِ یەك صاحب نـەفـەس کـە
بـەلــکـو دەردێ تــە دەوا کــە

شـیشـەیا دل زەنگ و ئارە
ڤـێ تـژی تـۆز و غـوبـارە
من ئومید شێخەك کوبـارە
دێ دلـێ من ئەڤ جـەلا کە

ســەيـيـد ئـەڤ شێـخـێ عظامە
مــورشــدە صــاحـب كـرامـە
گـەر نـەظـەر جارەك بدا مـە
قەلبِ مەجرووح دێ شفا كە

هـيـڤـی يـا مـن پـادشاها
سەييدێ سەممی يە تاها
من هەنە بێ حەد جەفـاها
هممەتا خوە ئاشكەرا كە

ئـاخـری پـايـانِ پــيــری
من گونەهـ ڤێ تێنە بیری
ئاهـ ل حـالـێ من فەقیری
ئەز ب قوربـان من لـقاكە

من هەنە سووچ و غەرامەت
دێ ل مــن بيتــن قـيامـەت
صــەدرِ ديــوانــا شـەفاعەت
مـەقـصـەدا مە تـو ئەدا كە

گــەر وەداعــی پــر گــونـاهـە
كـەفـتـی يـە حـالـەك تـەباهە
ب هـيـڤـی يـا رەحـمـا ئلاهـە
فـەضـل و ئـحسـانـێ عەطا كە

(١٨)

بهار هات و ب من خۆش نینە ئیرۆ
دلیٚ مـن بیٚ تـە پـڕ غەمگینە ئیرۆ

ژ هـجـرا تـە مـە دل شـبـهـی کـەبابە
من نە صەبرە, نە من تەمکینە ئیرۆ

رحا من با تەیە قالب ل ئێرە
ددلدا خارِ غـەم رستینە ئیرۆ

ژ بەر دەردان عەجەب بیٚ طاقەتم ئەز
ب مـن دنـیـا قـەوی چرکـینـە ئـیـرۆ

حەتا کەنگی بکێشم ئنتظاریٚ
تە هەل کر ئاگرەك دەر سینە ئیرۆ

وەرە جـارەك ب دیـدارا تــە شـابم
مە بیٚ تە دەرد و غەم پر دینە ئیرۆ

توی رووح و رەوان و راحەتا من
قرار و صەبر و بۆ من نینـە ئـیرۆ

ب رەحم و شەفقەتیٚ دیسا بنێڕە
بەسە جارەك تو من بێشینە ئیرۆ

ژ شــەوقـا مـحـبـەتـا جانان وەداعی
شەکر ئەفشان سوخەن شیرینە ئیرۆ

(١٩)

فەلەك بێ شەرم وەداعی بێ حەیایە
د گـەل ڤـێ رابـوارین پڕ جـەفـایـە

ببێ یا قەحبە تە دگەل من چ کینە
ژ بـۆ مـن ئـاوروو ئـێـدی نە مایە

غەمێ خەلقێ د سالێ جار و بارن
ژ من یەك لەحظە غەم نا بن جدایە

چ چەرخەك سەنگِ دل بێ رەحم و بێ داد
ب کـێـڕا یـارە, یـارەك بـێ وەفـایـە

مەگەر بەس نینە خوونخواری و ئەو ظولم
کـی یـە ژ دەسـت تـە نـە دیتی سەد بەلایە

ژ دەست تە شەربەتەك شیرین حەچی خوار
د پـێـڕا عـاقـبـەت ژەهـرێ تـە دایـە

حەمی کرنێ تە نە, فتنە, فەسادی
کـرن خـایـن کـور و بـاب و بـرایـە

(٢٠)

نامـا مشەررەف ژ بۆ مە هنارى
مـەضـمـوونِ نامیٚ درر و مرارى

تشتەك مشەررەف لائق تە نینە
خـۆشـتـر ژ جانـى نـا بت دیارى

مــن دل بــریــنــە ژ تـیـرا فراقیٚ
مەلحەم وصالە ژ من ڤـەشـارى

عەزما مە وەصلە قەصدا تە هجران
تە جـان دخوەستى من ڤیٚ سپارى

جــارەك د دلـــدا رەحــمــیٚ بگیٚرە
من ژدل و چەهڤان خوون ڤیٚ د بارى

یا رەب چ بهنە ل زلف و خالان
خـۆشـتــر ژ بـهـنـا نافا تەتارى

عـشـقـیٚ بـراشـتـم كرمـە كەبابە
مەئیووس وەصلیٚ كوشتم بژارى

چـاڤـیٚـتـە بـەنگـى تیرەك ل دل دا
ژ كـیٚ طـەلـەب كەم صـەبر و قرا رى

مەحبووبِ شیرین ب تە د نازن
د با غێ حوسنێ تو نووبهاری

دەردێ وەداعی دەرمان وصالە
یا رەب نەصیب کەی دیدارِ یاری

**(٢١)**

**من ژ حەق داخوازە دائم دێ ژ حەق دەستوور بی**
**هـەر بکـام و شـادمـان و خوررەم و مەسروور بی[١]**

**قـەط ددنـیـایـێ نـەبـیـنـی غەم ژ دەورانا فەلەك**
**کـەوکـەبێ بـەخـتـێ هومایوونی تە هەر پڕ نووربی**

**غونچەیا بەختێ تە خەندان بـی ب عـەیـش و نۆش و ناز**
**رووز و شەب ئەز ئافەتێ[٢] چەشمێ حـەسوودان دوور بی**

**هـەر د نـیـڤـا سـەرفـرازان بـەخـتِ یار و کامیاب**
**خەطّ ئقبال و کـەرەم بـەر روویێ تـو مـەسطوور بی**

**ئـەی جـەوان بـەخـت و فەلەك یار و کەرەمکارێ جهان**
**مـن ژ حـەق هـیـڤـی هەیە ملکێ تە دێ مـەعـموور بی**

**هەر کەسێ ڤێ دەولەتێ هەر دێ نەخوازت تا قیام**
**رووسـیـاه و شـەرمـسـار و خـەسـتـە و رەنـجـوور بی**

---

[١] . وداعی د ڤێ هۆزانا خۆدا چاڤ ل مەلایێ جزیری کرییە و هۆزانا وی یا:

**خانێ خانان لامعێ نەجما تە هەر پڕ نوور بی**
**کەشتیا بەختێ تە (از) بایێ موخالف دوور بی**

(بنێڕە: (دیوانا مەلایێ جزیری, تویژاندنا صادق بهاء الدین ئامێدی. ژ چاپکرییێت ئەکادیمییا کوردی, چاپخانا کۆڕی زانیاری کورد–بەغدا ١٩٧٧, بپ ٤٢١.)

[٢] . ئەز ئافەتێ: ژ ئافەتێ.

**نەزم و ئەشعارێ وەداعی گەر ببت مەقبوولِ میر**
**دێ د ئقلیمێ جهان شعرێ مە دێ مەشهوور بی**

(٢٢)

ئـيـرۆ ژ نـوو گـرتـــی سـەمـا
بـسـكـان ل دۆرا جـەبـهـەتـیٚ
نیشان و خال لێك بوون جەما
ڤێـكرا دكـەن خـۆش صحبەتیٚ

زلفەین ل سەر خـالـیٚ رەشین
تـاتـا ب دێـمـیـدا مـەشـین
خۆش بوونە شبهیٚ باوەشین
كـەفـتـینـە رەقـص و داوەتـیٚ

رەقصیـن ل سـەر دێـما گولین
بـسـكـیٚ سیـاه و سـلسـلـین
وەك من گەلەك مەجرووح دلین
دائـم د كـونـجـیٚ فـرقـەتـیٚ

ئەو فرقەت و هەجوا حەبیب
دیسا ژ بۆ من بوو نـەصیب
ئـەز ژار و بـیٚ یـار و غەریب
دائـم دكـێـشـم حـەسـرەتـیٚ

سەد حەسرەت و سەد ئاه و زار
یـار چـوویـە زۆزا نـێـد سـار
ئـەز مـام دگـەرمـیٚ بـەنـدەوار
گـاڤـەك تـەبـیـتـا مـن نـە تیٚ

صەبر و تەبیتا من نە مان
ژ بەر فرقەتا سەلوا چەمان
کوشتم ب سەد دەرد و غەمان
هشتم ل گۆشا محنەتێ

هەر چی د کەت هجران د کەت
پڕ عاشقان بێ جان د کەت
دەردان گەلەك دەرمان د کەت
خالا ل دۆرا جەبهەتێ

خالا ژ رەنگێ عەنبەرێ
بەژنا ب مثلێ عەرعەرێ
جارەك د نیڤا پەنجەرێ
فکریمە بەژن و قامەتێ

ئەو قامەتا بەژنا لەطیف
لبسێ دبەر کیمخ و قەدیف
گەردەن وەکی شووشا خەفیف
سبحان ژ شاهێ قودرەتێ

سبحان ژ شاهێ قادری
حوسنا بەدیع ڤی خەلق کری
لەو دل دەمەك نا صەبری
دائم دسۆژت ب ئولفەتێ

ئەو نەینکا حوسنا جەلا
زلفەك خوە ڤی تێرا  نوما
لەو دل ژ مـن ئیـرۆ رەوا
کـەتـمـە د بـارێ غوربەتێ

ڤـێ غـوربـەتـێ ئـەز کـرمـە ژار
لـێ فـرقـەتـێ ئـەز کـرمـە نـار
عـومـرەك وەداعـی رابـوار
ئەندووە و غەم بەحس ژێ نەتێ

(٢٣)

ژ بهنا گـەردەن و عەرقێ
بخارا مسك و عنبەر تێ
ژ عەطرێ گيسۆيێ فەرقێ
زباد و عوود و ئەزفەر تێ

زبـاد و عـوود و ماوەردان
صـەبا ئـانی ژ بەر پـەردان
دكەم ئاه ئەز ژ بەر دەردان
ژ دل ئاه و كەسەر دەر تێ

ژ دل ئـــاه و كـەســـەر تـێـتـن
هــنــاڤــێ مـن وەكـی پێـتـن
غـەمـان هـــەسـتـی ل من مێتن
ل سەر من غەم ب عەسكەر تێ

ل من هند عـەسكـەران راكـەی
دلـێ وێـرانـــە يـــەغـمـاكـەی
ژ وان قـەيـدان مـە ئـازاكـەی
دەوا بــەخـشـی ژ دلـبـەر تێ

دەوا بـەخـشـی تـو لـوقمانی
عـلاجـێ جـوملـە دەردانـی
حـەيـات و راحــەتـا جـانـی
ژ دەسـتـێ مـە ميەسسەر تێ

مـيـەسـسـەر بـا وصـالا تـە
مــە دی بــا قــەدد و بـالا تە
خــەبــەردان و مــەقــالا تــە
ژ لـەعلان قەند و شەککەر تێ

شــەکــەر لــەعــلا پــەریـزادە
دگــەل مــن ئــەو چ بــیـدادە
بــەس ئــاور غـەمـزەیـان بادە
خەدەنگ و قەوس و خەنجەر تێ

خــەدەنـگ و تیـرِ ئەندازی
ل جـەرگـێ مـن بەلـەنگازی
وەرە زوو گەر تو جانخوازی
چـڕا مــەســت و تـکەبەر تێ

د بــەزمــا ســەرخۆش و مەستان
صەفێ وان راست و چەپ وەستان
ددا مـەی ســاقــیــان دەســتــان
شــەمـیـمــێ عـەطـر پـەروەر تێ

شــەمـیـمێ مـسـكِ تاتاری
ڤــەدا بــەرقــەع ژ دیــداری
ل مـن رۆهـن كـر دلـێ تاری
بەژن وەك سەلـوِ عەرعەر تێ

بـەژن سـەلـوا شـرین بالا
بـبـم قـوربـان ئـەز ئـنـشالا
ب تـۆخ و بـەیـرەق و عالا
ژ بۆ گەشتا سەمەنبەر تێ

تە ڤێ گەشتێ و سەیرانێ
تە ڤێ چەرخێ و دەورانێ
خەبەر خۆش گەوهەرا کانێ
ب یاقووتێ د ئەحمەر تێ

نە یاقووتی نە مرواری
تویی ئەو گەوهەرا باری
ئەنی صۆرەت نویساری
خەطێ ( الله اکبر ) تێ

ژ خەططێ (احسن التقویم)
کو حوسنا ڤی بوویە تەقدیم
ل سەر مە واجبە تەعظیم
جەمالا بەیت و حەجەر تێ

جەمالا پڕ کتابەت لێ
حەدیث و شەرح و ئایەت لێ
نەجات و هەم هدایەت لێ
گەلۆ بۆ کێ مقەددەر تێ

مقەددەر بوون هەمی نامە
نـویـسـینـە ئەزەل خامە
گـونـەهـکـارم وەلێ شا مە
مـە پـێ ئیمـان و باوەر تێ

شـــوکـــردارم ژ دانـــا تـــە
چ بـێـژم ئـەز نـشـــانـــا تـە
کـوسـا وەصـف و بـەیـانـا تـە
د حەددێ شەرح و دەفتەر تێ

ب حەققێ ذاتێ ئەعلا کەی
دەما نەزعێ تو من شا کەی
ل من ئەحمەد تو پەیدا کەی
ب ڤێ رەوضـا مـنـەووەر تێ

خـــودانـــێ مـــەرقـــدا نـــووریـــن
تـــویـی طـــاهـــا، تـــویـی یاسین
وەداعـــی مـــایـــە پـــر غـــەمگین
شەفاعەت ژ دەست پەیەمبەر تێ

(٢٤)

ژ دەردێ عـشــقــێ پـامالم
بوويم رسوا ئەز ئـەنجامـێ
ب وەجد و جـەزبـە و حـالـم
ل من بێ حەد حسێن عامێ

حسێن عامێ و هەر فـەردە
ل مـن ئـێـدی نـەمـا پـەردە
عەجەب دشوارە ئەو دەردە
کـوسـا کـەم صـەبرە ئارامێ

دەرێ صەبرێ ل من بەستن
شـەکـر لـەعـلـن قە ناوەستن
ب تیر و نـاوەك[1] و شـەسـتن
کـەمـانـداریـدِ گـولـفـامێ

ئـەوا گـولـرووو زبـان سۆسن
پـەری تـەکـلـیـف کـرن بۆ من
ل مــن ئــاخــر کـو بۆ دژمن
چ خۆش کێشامە ڤێ دامێ

بـدامــێ گـرتـم ئــەز مـوحکەم
هــزار ئــاە تـێـنـە من هەر دەم
تویی هەم دەرد و هەم مەلحەم
تـویـی بـەخـشـندەئـێ کـامێ

[1] ناوەك: سەرتیر، بووڕیکەکا بچویکە تیران تێرا دهاڤێژن.

تویی خەلقێ دکەی ئەبتەر
نـمـا شـەهـزادە ئـو دلـبەر
کـەلا عـشـقـێ کرە مـەیتەر
....تـیـمـار کـرن جـامـێ

کـەسـێ عـاشـق ل دیـدارێ
د ئـەمـر و خـدمـەتـا یـارێ
ل خوە ئەو دێ نەکەت عـارێ
بـلا بـێـژن ب بـەدنـامـێ

هەچی یار حەز بکەت قەنجە
بـلا عـالـەم ببـێـن رەنجە
یـەقـیـن بـۆ عاشقان گەنجە
وەداعـی هـێـژ تـویی خامێ

دنێ عـالـەم نـە راضـی بن
هـزار مـفتـی و قـاضـی بن
شغل دێ بخواهەشافی بن
ژ شـەرقـێ و حەتا شامێ

(٢٥)

((وله بترتيب حروف الهجاء))

أ

ب مثليٚ ته نههن مەوزوون و زيبا

د لبسێ ئەطلەس و خارا و ديبا

ئەزم ئامانج تيرێ قەوس ئەبروو[1]

بکه دەرمان برينا من طەبيبا

ب

دکەم ئەفغان دنالم رووز و تا شەب

دبوورينم ژ چەرخی ئاه و يارەب

جەمالا ته ل من ڤێ بوويه حەسرەت

ژ هجرا ته لمن زندانه خۆشەب

ت

ئەڤە لوقمان برينداران دەواکەت

ژ قەيدا دەردِ بيماران رەهاکەت

ژ غەيری ڤی طەبيب ئێدی تو نينن

مەريضێ بێ علاج ئەو دێ شەفاکەت

ث

م دی بلبل دگەل وەردان دکر بەحث

ژ ئاهێ دل غەم و دەردان دکر بەحث

فەلەك با کەس دو رۆژان نينه يەکسان

ژ دەستی چەرخ وان هەردوان دکر بەحث

---

[1] .Ezim amanc-i tîrê qews-i ebrû

ج

ب دنیاییٚ چ کەم بیٚ گەردەنا عاج
دلیٚ سۆتی ژ ژەنگیٚ مایی بیٚ زاج
زکاتا حسنِ رویٚ خوە ببەخشە
ئەزیٚ مسکین ل دەرگاهیٚ تە موحتاج

ح

نەبۆ جارەك ل من وەصلا تە مەفتووح
فدایێ بەژن و بالایا تە بت رووح
نەشێم ئێدی بکێشم ئنتظاریٚ
(( مرا عمری درازی نیست چون نوح ))

خ

دلیٚ من ما د بەندا روی فەرروخ
ئەسیریٚ زلف و ئان کیسوی فەرروخ
دبت یا رەب ببینم جارەکێ ئەز
جەمالا گول روخا هندوی فەرروخ

د

ژ غەیری تە مە نینن قەط چو مەقصود
توی ئیرۆ د شەهریٚ حسن مەوجود
فراقا تە ژ سەر تا پایی صۆتم
ب حالیٚ من تو بینایی و مەعبود

ز

د هجریٚ بیٚ تە دەر تاب و تەبم ئەز
فراقیٚ سۆتمە قوربان تەبم ئەز
ژ وان لەعلان ببەخشە بۆسەیەك دو
ژ وەصلا تە قەوی تشنە لەبم ئەز

ر

د حوسنێ زێدەئێ ئەز ماه و زەخوەر

هەمە عالەم ببن قوربان تە یەکسەر

چ بێژم شەرحِ ئەوصافێ تە جانا

نەشێتن کەس بکەت وەصفێ تە دەفتەر

س

غەریبم بێ نەوا بێ یار و بێ کەس

دبوورینم فغان ئەز چەرخِ ئەطلەس

هەمی عالەم د زانن مەقصەداخوە

ژ مەصودێ دو عالەم من توی بەس

ش

نگارا نازکا مەحبوب و دلگەش

قەد و بالایێ رەفتارا شرین مەش

خوزی جارەك میەسسەربا ژ بۆ من

وصالا نازکا مەوزوون و مەهوەش

ص

خوزی جارەك بچووما مەجلسا خاص

ل با ڤێ نازەنینا پاكِ ئخلاص

بە بلبل را هەم ئەفغانم دەما دەم

مثالێ زەهرە بەر گەردۆنێ رەققاص

ض

ژ شەمعێ نا کەتن پەروانە ئعراض

(چە جای توبەئی زهاد مرتاض)

خوزی جارەك ڤەخوارا جورعەیەك من

ژ جاما بادەیا گلگۆنِ فەیاض

ط

ل حالێ من نه پرسی جارەکێ قەط
مە هێستر تێن ژ چاوان هەر وەکی شەط
ژ بۆ وان خال و نیشانێ تە پڕ هوور
کو ئوستادێ ئەزەل کێشانە ئەو خەط

ظ

د هجرێ مامە بێ ئەفکار و بێ حەظ
رەقیبان شانە ئەز غەمخوار و بێ حەظ
تنێ ئەز مام د بەندا محنەتێ دا
غەریب و بێ دل و بێ یار و بێ حەظ

ع

بجارەك دیتنا ڤێ بوومە قانع
وەلێ زلفەین ل دێمی بوونە مانع
ل صەفحێ روو بنێ نیشان و خالان
(تعالى الله) کو خۆش نەققاشە صانع

غ

مە دل پڕ دەردە ئیرۆ سینە پڕ داغ
مەگەر لقمان م داواکەت ببت ساغ
ژ دینا ڤێ تنێ ئیرۆ غەریبم
چکەم با گەشت و سەیرا گولشەن و باغ

ف

مە ساقی دیت و جامەك بادە دەر کەف
دنۆشین سەرخۆشان ئەو بادە صەف صەف
ژ جامی جورعەیەك ساقی کو دا من
کرم سەرخۆش دگەل وان بێ هشان خەف

ق

نزانم لەعلن ئەو لەب یانە یەعقیق
د باغێ حسنِ یەکتایی ب تەحقیق
طـەلـەبـکـارم ل دیـدارا تـە ئـیـرۆ
د عشقێ ثابتم بال حەققێ تەوفیق

ك

د هـجـرێ سـیـنـە پـڕ دەردیمِ دلتەنگ
ضەعیف و لاغر و رووزەرد و بـێ ڕەنگ
دگەل هەر کەس سەری صلحێ دگێرت
دگـەل من ڤـێ عتابە زەجرە هـەر جەنگ

ل

ئـەزێ بـێ خـان و مان و یار و مەنزل
بدیـنـا ڤـێ نـەبووم یـەکجـار واصل
مـە ئـەڤ عـومرێ کرامـی دایـە بەرباد
د هجرێ مام ب ڤی کارێ هـە مشکل

م

د کـونـجـێ فـرقـەتـا ڤـێ پڕ حەزینم
دەمــادەم بــا غــەم و ئـاه و گـریـنـم
خوداوەندا میەسسەر کەی ژ بـۆ مـن
ب چـاوان ئـەز جـەمـالا ڤـێ ببـیـنم

ن

یەقین عاشق حەمی بێ هۆش و مەستن
ژ جـامـا بـادەیـا عـەهـدا ئـەلـەستن
کەسێ ئەڤ مەی نە نۆشی مایە نەومید[1]
بـەلـێ ئـێ خـوار و فـارغ بـۆنـە ڕەستن

---

[1] نەومید: بێ هیڤی.

ه

چ نازك مەهوەشە شیرین صفاتە
نەباتە لەب دەهەن ئاڤا حەیاتە
ببەخشە مە فەقیر و بیٚ نەوایان
ل حوسنا تە بوویە واجب زەکاتە

و

وصالا تە ل من نەورۆزە ئیرۆ
رەقیبێ رووسیەهـ جان سۆزە ئیرۆ
(بحمد الله) ل دیدارا تە شا مە
ل من طالا[1] قەوی فیرۆزە ئیرۆ

لا

تە قامەت سروە یا شمشادە بالا
ژ سرویٚ زیٚدەتر ئازادە بالا
د حوسنیٚدا تو چاوا سادە رەنگی
د بەژنیٚدا وەرەنگ ئازادە بالا

ی

مەکە بەربادە ڤی عومریٚ کرامی
ل پیٚ ئەشعار و ئەبیاتان تەمامی
فەرەض یەك دو وەرەق دی رەشکرن تە
وەداعی بەس کە بیٚ هۆدە کەلامی

---

[1] طالا: طالع

(٢٦)

يا رەب تو حەییی و قادری
لوطفا تە عامە یا لەطیف
ترسم ژ هەولا ئاگری
لوطفا تە عامە یا لەطیف

نارێ جەهەننەم پڕ شەدید
ژێ تێ صەدا (هل من مزید)
یا رەب بگێری من سەعید
لوطفا تە عامە یا لەطیف

ئەز بجاهلی و ئەحمەقی
دزانم ئلاهی تو حەقی
یا رەب نە گێری من شەقی
لوطفا تە عامە یا لەطیف

نەفسا مە پڕ شوومە, بەشەر
ترسم ژ بەر نارێ سەقەر
هەر دەم دکەم فکر و حەذەر
لوطفا تە عامە یا لەطیف

فعلێدِ من بالجملە بەد
من غەیری تە نینن مەدەد
هیڤم تویی شاهێ ئەحەد
لوطفا تە عامە یا لەطیف

وەقتىێ ب دەرتێتن نـەفـەس
نەسپێرە بێ ئیمان چو کەس
یـا رەب تـویـی فـەریـادِ رەس
لـوطـفـا تـە عامە یا لـەطیـف

وەقـتـێ د قـەبـری بم ئەسیر
گـاڤـا کـو تێن مـنـکر نـەکیر
لوطفا خوەدێ من دەسـتـەگیر
لوطـفـا تـە عـامـە یـا لـەطیف

من پڕ هەنە سووج و جرم
نەفسا خراب ئەز بەد کرم
دئسمێ غەفوور ئەز د فکرم
لوطفا تە عامە یا لەطیف

فعلێدِ من جملە خەطـا
کـارێ تـە ئحسانە عـەطا
جرمم ببەخش ئەی رەهنما
لوطفا تە عامە یا لەطیف

بێ حەددِ من عصیان کرن
هن عەمد و هن نسیان کرن
پێ غایەت و پەیمان کرن
لوطـفـا تـە عامە یا لەطیف

جرم و گوناهم بێ شمار
وەقتێ د قەبری بم ستار
عەیبم بپۆش ئەی کردگار
لوطفا تە عامە یا لەطیف

ئەز ئەڤ گونەهکارێ خەجل
دبارم ژ چاڤان خوون دل[1]
هیڤم (نبي) خیر الرسل
لوطفا تە عامە یا لەطیف

فعلێدِ من جملە خراب
نەفسێ ب یا بەد کر شتاب
یا رەب چ بێژم ئەز جەواب
لوطفا تە عامە یا لەطیف

هەر چی کو نەفسێ گۆ، مە کر
نیشا مە دان جرم، وزر
مەقبوول دبن تۆبە شکر
لوطفا تە عامە یا لەطیف

سەد شکرتە ئەی پادشاه
هەر چەند هەنە من پڕ گوناه
ژبۆ عاصیان عەفوا ئیلاه
لوطفا تە عامە یا لەطیف

---

(١) .Xûn-i dil

تـرسـا ل مـن نـيـرانـه هـەر
داخـوازا مـن ئـيـمـانـه هـەر
رەحما تە لێ دەرمانە هـەر
لوطفا تە عامە يا لـەطيـف

جارەك وەداعی توویە کە
فـعـلـێدِ بـەد بـەر پـێ مەکە
ژ نەفسا خوە دائم لۆمەکە
لوطفا تە عامە يا لـەطيـف

## ٢٧

**((در ثنای باری تعالی وآمدن باران**
**در ماه کانون اول ســـنه ١٢٣٩))**

**گـەلی خـەلقیٚ کو هشیارن**
**حـکــایـەت کـەم ژ بارانـیٚ**
**دو کانوون و مـەهـیٚ صـارن**
**د فـەصــلا ڤـیٚ زڤـسـتانیٚ**

**وەکی کانوون گها چاردان**
**خـودیٚ نـازل کره عـەردان**
**ل مـە بـاری گـەلـەك بـاران**
**خـوداوەنـدا تـو سبحانی**

**خودیٚ خرکر ژ گـەردوونیٚ**
**هـنــار بـاران د کـانوونیٚ**
**مـەبـن غافل ب قـانـوونیٚ**
**نـەبـن مـەغـرورِ دەورانـیٚ**

**ب دنـیـــایـیٚ مــەبـن غـافـل**
**بــنــیٚــرن قــودرەتــا کــامــل**
**ل مـە شین بوون گول و سنـبل**
**بــنــیٚــرن لـوطـف و ئـحسانیٚ**

بـنـێـرن قـودرەتـا بـاری
ل عەورێ رەش کـرە تـاری
ئـلاهـی هـەر تـو غەففاری
خلاص کەی مە ژ عصیانێ

ژ عصیانان مە یەکجاری
ب ڤێ رەحما تە یـا بـاری
بـگـێـڕە موجبێ نـاری
ب حەققێ جوملە قورئانێ

خـودێ دانـا و عـەللامە
کـو بـارانـا ئـەڤـی دامە
یەقین ئەڤ رەحمەتا عـامە
هـنـاری بـۆ مـە ئنسانێ

هـنـاری بـۆ مەرا رەحمەت
ژ بۆ ڤی هەر هەیە قودرەت
ل مـە دنـیـا کـرە جەننەت
د کـانـوونـان بـهـار ئانێ

بنێ ئیسـال دنێڤ سالان
لەیی مەشیان د کەندالان
ل بـەرفـێ ڤـی کـرە تـالان
بـوویـە نـەورۆز سولتانێ

ژ بەرفێ جە هەمی رەش بوون
وەلاتێ مە عەجەب خوەش بوون
سەمەن نەسرین ل مە گەش بوون
بنێ فەصلا گولستانێ

بنێ جارەك چ لێمشتن
ژ بەرفێ ڤی چیا ششتن
وەلات و جە كو رەش هشتن
خوویا بوون چیمەن و كانی

چ بارانێ د بۆش هاتن
ب ئاواز و خرۆش هاتن
نهێل رابوون بجۆش هاتن
مثالێ ماهِ نیسانێ

وەداعی پر گونەهكارە
ل سووجێ خوە ب ئقرارە
بەلێ ناڤێ تە غەففارە
عەفووكەی ڤی ب غوفرانێ

(٢٨)

سبحان ژ ته ئەی ذو الجلال
پێلا هەبوو مـن تشت و مال
دکـرن ژ مــن پـرس و ســوال
ئـەلـلاه دزانــت حـکـمـەتـێ

یووسف ته دایێ حەشمەتە
ئەییووب تـه دایـێ راحـەتـه
کـارێ تــه لـطف و رەحمەتە
هەر چی قەلەم گەرها وە تێ

رۆژا تــه ئــادەم کــر وجــوود
ئـبـلـیـس ئنکار کر سجـوود
پاشی ته ئەی حەی و وەدوود
ئـاڤێـتـه تـۆقـا لـەعـنـەتـێ

سـبـحــان ژ تـه یـا قادری
رۆژا ته مەخلووق چێکری
هند جەننەتی هند ئـاگری
قەط کەس نزانت عللـەتێ

تـەقـدیـر و کارێ ئەللەهە
کەس پێ نە کریە ئاگەهە
دێ ژێ نـەبین چ تێ نەهـە
ئەصــلا عەقل رێ نا بـەتێ

ئـەی حـەق شـنـاسـێ ذی عقوول
ناگرت ژ دەست عـەبدان تـو شوول
هــشــیــارِ ئــەلــلاه بــن رەســوول
نــا بـن تـو شــوول بــێ مـەشیـەتێ

بێ مەشیەتـێ نـا کــەن دیـار
ئێ خەلق کـری لەیل و نـەهار
نویسین ئـەزەل تەقدیر و کـار
ئــیــرۆ نــزانــیــن روئـیــەتـێ

هندی قەضا رۆژا ئـەزەل
تەقدیر کرینە بێ خـەلـەل
قەنجِ خـرابی هـەر عـەمـەل
پــێ عــالــمـە ب علمیەتێ

ئەی عــالــمــێ ســررا ظـەهـیر
ب هندی کە ئەشیایان خـەبیر
هند خـەلـق کـرینە سینە تیر
هــنـدەك گـهــان مـەعـریفەتێ

هـنـد خـەلق کرن بۆ نارن ئەڤ
هــنــد لائــقــێ دیــدارن ئــەڤ
خۆش حکمەتن ئەسرارن ئەڤ
خەلقنۆ بکـەن ژێ خـەشیەتێ

یا خێر ئەڤە هەر بۆ مەرا
مابەین خەوفێ بن رجا
دائم بکەن فکرا خودا
نەومید مەبن ژ رەحمەتێ

جوهدا ری یا دینێ موبین
بپرسن بزانن ئەم یەقین
عالم چ بێن تابع ببین
تەتێ کە وەقتێ رحلەتێ

خۆ سپارە لوطفا ڤی بکەن
بگرین و هەر هیڤی بکەن
تەرکا حەچی مەنهی بکەن
بەلکی ل مە بکەت رەحمەتێ

بەلکی خودایێ کردگار
ببەخشت مە ئێد نا پاک[1] کار
خلاس ببن ژ هەول و نار
فریاد ژ رۆژا ساعەتێ

خەشیەت بکەن ژڤی خالقی
هندەك نویسینە شەقی
هندەك سەعید گێران حەقی
میرا سرە ب علمیەتێ

---

[1] .Napak-i kar

مـیـر چ بـکـەت لا یـەسئـەلی
مــخــتــارِ عـەمـمـا یـەفعەلی
دێ پــرس ببـن ژ نــی جەلی
یا رەب کەرەم ژ شانێ تە تێ

فعلێ وەداعی پڕ خـراب
توبوا الـی الله فـی الـمـآب
لا تـخذني یــوم الـحـسـاب
دکــەن هـیـڤیـا مـەغفرەتێ

سەر تا قەدەم شووم و شەرم
بـۆ عـاصییـان سەر دەفتەرم
لـێ ژ ئـومـمـەتـا پـێـغمبەرم
ب هـیـڤـیـیـا شـەفـاعـەتێ

## ٢٩[*]

### ((در مرثیەء شیخی بیك حاكم مكس))

ئیرۆ ژ دەستێ فەلەکێ
کانێ جهانگێرێ[١] جهان
بگرین ژ بۆ شێخی بەگێ
کانێ جهانگێرێ جهان

میرێ ب ئحسان و کەرەم
کان صاحبێ جوود و نیعەم
وەصفێ د ڤی هەر دێ بدەم
کانێ جهانگێرێ جهان

چاغێ د ناڤ کۆمێ دکەت
هەیبەت ب سەر رۆمێ دکەت
ما ئەڤ فەلەك دۆمێ دکەت!
کانێ جهانگێرێ جهان

---

(*) .هەژی گۆتنێیە, کو وداعی ئەڤ هۆزانە لسەر ئاوایێ هۆزانا ئەحمەدێ خانی "کانێ محەممەد بەگ گەلۆ... کان پادشاهێ سەرحەدان" نڤیسییە. ئەحمەدێ خانی هۆزانا خۆ لسەر محمد بەگێ حاکمێ بازیدێ گۆتییە, وداعی ژی لسەر شێخی بەگێ میرێ مکسێ گۆتییە. بۆ پتر پێزانین لسەر هۆزانا ئەحمەدێ خانی بنێڕە: (دیوانا ئەحمەدێ خانی و شەرحا وێ: عبد الرحمان دوررە. وەشانخانەیا ئاڤەستا- ستەمبوول ٢٠٠٢, بپ ٤٩.)

(١) .ل ڤێرێ ئەم نزانین هەلبەستڤانی (حهانگیر) بلێڤ کری یە, یان (جهانگێڕ), ژ بەرکو د رێنڤیسا کەڤن دا خۆیا نینە.

رۆمـێ دەمـا عـەسـکەر دکر
بێ حەدد و بێ دەفتەر دکر
میر لەشکەرێ وان کەر دکر
کـانـێ جـهـانـگـێـرێ جهان

مـیـرێ ب ئحسان و خەلات
ژ رۆمـێ ڤـەگـرتـن پڕ وەلات
عەسکەر ژ بۆهتـان بۆ دهات
کـانـێ جـهـانـگـێـرێ جهان

کـانـێ گـەلـۆ مـیـرێ ب ناڤ
عەسکەر ل رۆمێ کـر بـەلاڤ
دژمـن بـەزانـدن ڤـی تـەڤاڤ
کـانـێ جـهـانـگـێـرێ جهان

ئـەڤ حـاکـمـێ پڕ ناڤ و دەنگ
ژ رۆمێ ڤـەگرت تۆپ و تڤەنگ
دژمـن ل بـەر مـابوونـە تـەنـگ
کـانـێ جـهـانـگـێـرێ جـهـان

مـیـر پـڕ هـەبوو قەدر و رەواج
پـێـچـان ئـەڤـی رۆم و حەلاج
ژ بەحران د هات ژێـرا خـەراج
کـانـێ جـهـانـگـێـرێ جهان

خەصمێ شکاك و وانی یان
کان دژمنێ ئەرطووشی یان
کۆچەر ل بەر میر لەرزی یان
کانێ جهانگێرێ جهان

حازر د ئمدادا د میر
هیزان و شێروان و جزیر
حەتتا خۆشم ناکەم ژ بیر
کانێ جهانگێرێ جهان

رۆمی د قەلسن بێ زراڤ
د لەرزین وەکی تووڕا د ئاڤ
سەرحەد هەمی هاتن سلاڤ
کانێ جهانگێرێ جهان

سەرحەد سەلامکارێ تە بوون
دژمن بریندارێ تە بوون
ژار و فەقیر بارێ تە بوون
کانێ جهانگێرێ جهان

وەك میر نەبوون عالی هیمەم
د کرمانجیێ حەتتا عەجەم
کان لەشکەر و جەیش و حەشەم
کانێ جهانگێرێ جهان

بـەردا وەزیـر و بەگـلـەران
شەبخوون ددانە عەسکەران
نـایێنـە شـەرح و دەفتەران
کـانـیێ جـهـانـگێریێ جهان

کـان حاکمیێ عالی جەناب
وەصفیێ د ڤی نابن حساب
لیێ فەلەکیێ زوو کر شتاب
کـانـیێ جهانگـێریێ جـهـان

مـا مـیـر تنـیێ ئحسـان دکر
فەرماندەهـی ل بەحران دکر
ڤی سەروەری ل وەستان دکر
کـانـیێ جهانگـێریێ جـهـان

مـا میر تنیێ وەستان ڤەگرت
ل بەر کۆچەران زۆزان ڤەگرت
حەتتـا جهیێ بۆهتـان ڤەگرت
کـانـیێ جهانـگـێـریێ جـهــان

دژمـن لبەر میر بوون زەبوون
وەستـان و شاخ وەرگـرتبوون
فـریـاد ژ چـەرخـا وا ژ گوون
کـانـیێ جـهـانـگـێـریێ جـهـان

هەر چی دەما میر با سوار
دژمـن دبـوونـه تـار و مـار
وەرگـرتـبـوو حـەتتا خـومار
کـانـێ جـهـانـگـێـرێ جـهـان

ما کەس هەبوو ڤێرا مـەجـال
دائـم هـزار مـێر بوون ل بـال
تـەقـدیـر حـەقە نا بت بەطال
کـانـێ جـهـانـگـێـرێ جـهـان

چبکەم ژ ڤێ چەرخا فـەلـەك
موهـلـەت نەدا چاڤێد بەلـەك
ڤێ نـازەنـین کوشتن گـەلەك
کـانـێ جـهـانـگـێـرێ جـهـان

جـارەك ل تـەقـدیـرێ بنێ
چەرخی گەراندە کوشتنێ
نـاڤ و کـەرەم هـشـتـە دنـێ
کـانـێ جـهـانـگـێـرێ جـهـان

عەسکەر هەگرت و چوویی شـاخ
پـێـکـڤـە هـنـارن چـوویـە تـاخ
ئـەڤ چـەرخ پـڕ ئـازارە ئـاخ
کـانـێ جـهـانـگـێـرێ جـهـان

ژۆریان شهاند و میر برن
سەد سووند و عەهد ژێرا کرن
مەکرێ ژنان هەر حازرن
کانێ جهانگێرێ جهان

میر خوەندن و برنە حەرەم
ژێرا کرن سووند و قەسەم
ڤێکرا کرن لوطف و کەرەم
کانێ جهانگێرێ جهان

چبکەم ژ تەقدیرا جەبار
دەستوور نەدان میر بێتە خوار
وان هشتە ژۆر ئەڤ شەهسوار
کانێ جهانگێرێ جهان

میرێ کو پڕ قەدر و وقار
ئەڤ حوققەبازا حیلەکار
شێخ شاند و خەنجەر ژێ ڤەشار
کانێ جهانگێرێ جهان

حەتتا کو میر رازا بخەف
نەصرانی یان گرت چار طەرەف
سەد حەیف کو میر کرنە تەلەف
کانێ جهانگێرێ جهان

زیندی چ کر چەرخا جهان
ئەڤ حاکمێ پڕ دەست و دان
کوشتن ب دەست نەصرانی یان
کانێ جهانگێرێ جهان

بابێ فەقیر و رێوی یان
دەرییێ مراد و هێوی یان
سەد حەیف میرێ مکسی یان
کانێ جهانگێرێ جهان

مەدحێ د میر من کر تەمام
دائم ژ حەق لێ بن سەلام
هەر شابت ئەڤ جەننەت مەقام
کانێ جهانگێرێ جهان

هەر چی دبێژم هەر وە بوو
مەدحێ د میر هێژ زێدە بوو
قەت کەس ل ڤان وەصفان نە بوو
کانێ جهانگێرێ جهان

یا رەب بحەققێ قودرەتێ
میر چوویە مالا ظولمەتێ
شا کەی ب لطف و رەحمەتێ
کانێ جهانگێرێ جهان

یـا رەب ژ تـه دەستوور بتن
قـەبرا ڤـی هەر پڕ نوور بتن
مەحرەم سەرایێ خـوور بتن
کـانـێ جهـانگـێرێ جهـان

قەط مثلێ خان مەحموود یەکێ
نــیــنــن ددەورا فــەلــەکــێ
خۆش بت ل جه شێخی بـەگێ
کــانــێ جهـانـگـێـرێ جـهــان

هەر چی بڤێ ڤی هەر وەبی
چەندی دنێ بی، هەر هەبی
طـالع ل وی فـەرخـونده بی
کـانـێ جهـانـگـێـرێ جهـان

مـن دل ژ بـۆ مـیـر سۆهتی یه
دێ بەحس بکەن ژێ عـامی یه
بـێـژن وەداعـی گـــۆتـی یـه
کــانـێ جهـانـگـێـرێ جـهــان

یا قەنج ئەوە ئەم ڤێ بکەین
نــاڤـی ل تـاریـخـێ بـدەیـن
بۆ غەین و رێ و لام و زەین

١٠٠٠ ٢٠٠ ٣٠ ٧

کانیێ جهانگێریێ جهان

(٣٠)

سەلامێد من ئەنا گۆییێ
ببن عەرضە ددیوانیێ
ژ بهنا مسك و ئاهۆییێ
ببن مەقبوولِ سلطانیێ

دەما بایێ سەحەر تێتن
دعاییێ من دگەل ڤی نە
بکە پرسیێ کو دەرتێتن
ل حالیێ من ئەناخوانیێ

مبارەك بیت ئەو مەسنەد
مظەففەر بی ددنیاییێ
ب حەققیێ واحدیێ سەرمەد
نە بینی غەم ژ دەورانیێ

ل تە فیرۆزە بت ئەڤ تەخت
تو روونە شبهەتی خاقان
فەلەك هەم یار و هەم دەولەت
ژ نوو کەی گەشت و سەیرانیێ

ب ئقبـال و ب دەولـەت بی
بـبـی مـەشـهوورِ دەر عالـەم
ل ئەعدایان ب نەصرەت بی
نـەبینی قەت چو نوقصانێ

د مـەدحـێ مـیـر[1] نوقصانم
نــە لائــق حـضـرەتـا مـیـره
ل ڤـێ نـەسـلـێ ئـەنـاخـوانم
ب مەدحێ شەککەر ئەفشـانێ

ئەگەر ئەز دوور وە گەر حاضـر
وەداعــی هــەر دعــا گــۆ مــە
قـەبـوول کـەت خــاطـرا عـاطـر
ب عــەیـنـێ لـطـف و ئحسانێ

[1] .Mîr-i

(٣١)

**من ژ حەق داخوازە میرم**[1]

**حەق نگەهداریێ تەبی**

**سۆرەئیێ (انا فتحنا)**

**یاوەریێ کاریێ تە بی**

**شوهرە دەر ئافاقِ باشی**

**عادل و هممەت بلند**

**کامکارا دەر جهان**

**دائم فەلەك باریێ تە بی**

[1] . ئەڤ مالکێت هەنێ لسەر ئاوایێ هەلبەستەکا مەلایێ جزیری هاتینە نڤیسین, یا کو سەرێ وێ دبێژیت:

ئەی شەهنشاهێ (معظّم) حەق نگەهداریێ تەبی

سورەئیێ (انّا فَتَحنا) دوور مادارێ تەبی

بنێرە: (دیوانا مەلایێ جزیری, تویژاندنا صادق بهاء الدین ئامێدی, بپ ٤١٦.)

(٣٢)

گوهـ بدێرن هوون ل من خەلقێ جوات و صحبەتێ
قەنج ژ ڤی چەرخی بترسن ژێ بکەن پڕ فکرەتێ
راستِ نابت رۆژەکێ بۆ کەس ب مەیل و موحبەتێ
حیلەکارە ئەو ددەت خەلقێ ژ ژەهرێ شەربەتێ
ئەحمەق و جاهل ئەوە ئێ پێ بغاری دل دەتێ
بێ رەواجە ڤی زەمانی مەعریفەت
بێ گومان بێ قەدرە ئێدی علم و خەت

شەکوەئێ لەو ئەز د کەم بۆ یار و دۆست و هەمدەمان
ئەلئەمان ئەز دەستِ چەرخێ بێ مرووەت ئەلئەمان
راحەت و دلخۆش نە دی من کەس ژ چەرخی بێ گومان
بفکرن جارەك لدونێ منعکس بوویە زەمان
قەت ژ تەرتیب و ئەدەب ئسلوب و یۆل ئێدی نە مان
بێ رەواجە ڤی زەمانی مەعریفەت
بێ گومان بێ قەدرە ئێدی علم و خەت

ئێ کو قمسی و حەسوود و فتنە ئەنگیز و نەمام
پیشی مەعقوولان بڕوو لێ رەغبەتن سەد ئحترام
بەلکوو دسپێرن ب دەستێ وان ئمووری (بالتمام)
دبنە ئاگر بۆ مسلمانِ دسۆژن صبح و شام
دین فرۆش و ظالمن ئەو هەر ژ بۆ لوقما حەرام
بێ رەواجە ڤی زەمانی مەعریفەت
بێ گومان بێ قەدرە ئێدی علم و خەت

ئـێ کـو نـاڤـێ دا و بـابـان کـەس نـەزانـیـتـن چی یە
ب رەغبـەت و قـەدرە ل پـێشـە ڤـی دۆرا وی (کـەتـی یـە)
مـال و دەولـەت ڤی د دەست دا خـەلق دکەن ژێ هیوی یە
ئـێ ژ ئـۆجـاغـێ مـەزن ئـیـرۆ د بـیـنـی بـرسـی یـە
گـوه نـەدان ئـۆجـاغـزادان کـەس تـو جار ڤی عەصری یە
بـێ رەواجـە ڤـی زەمـانـی مـەعـریـفـەت
بـێ گـومـان بـێ قـەدرە ئـێدی عـلـم و خـەت

ئـەو چ دەورانـە چ تـەبـدیـلـە گـەلـۆ دیـسـا مە دی
قـەت نـەمـا شـۆلـەك ل ئـسـلۆبا بەرێ ڤی سەرحەدی
راسـت نـابـت چـەرخ کەچ روو خاین و خوار و بەدی
کـەس وەفـا و ئـعـتـبـار ئەصلا ژ ڤـی دەوری نە دی
سەر هەلینان نا کەسان ئێ جنسِ پـاك مـن بەرزە دی
بـێ رەواجـە ڤـی زەمـانـی مـەعـریـفـەت
بـێ گـومـان بـێ قـەدرە ئـێـدی عـلـم و خـەت

(٣٣)

بحمد الله دەرێ مەيخانەئێ عشق
ڤەبوو ديسا ل من ديوانەئێ عشق

وەرە ئەى عشق هممەت (كە) دگەل من
ژ بۆ من قصصە كە ئەفسانەئێ عشق

د ملكێ دل ل سەر تەختێ خوە روونە
ب شەئن و شەوكەتێ شاهانەئێ عشق

دەما پەيدا بيى وەعدە ل من بت
دو سەجدان ئەز ببەم شوكرانەئێ عشق

ب ديدارا تە دێ رەوشەن بت ئەو ملك
عمارەت كە دلێ وێرانەئێ عشق

دڤێ رێدا گەلەك چوون و نە هاتن
نەشێ كەس طەى بكەت مەيدانەئێ عشق

مەگەر هممەت بكەت پيرێ طەريقەت
ببن ئەم ئاشنا فەرزانەئێ عشق

تو مورغێ[1] چينەئى[2] ئەمما وەداعى
وەلێ نە مورغى لائق دانەئێ عشق

---

[1] . مورغ: تەير.

[2] . چينە: ئەو دندكە يا تەير نكلێ خۆ لێددەت.

(٣٤)

(يا رسول الله) رەسوولێ خالقێ ئەكبەر تويى
صەدر ديوانا قيامەت قازيێ مەحشەر تويى

ريزە جوويێ سفرەيا تە ئەنبيا و هەم (رُسُلْ)
(رحمةً للعالمين)ى سەييدێ سەروەر تويى

ئەز فەقيرم بێ نەوا مستەغرقێ بەحرا گوناه
شكر لله دادخواهێ ئوممەتێ يەكسەر تويى

(يا شفيع المذنبين) هيڤم تويى رۆژا جەزا
شافعێ خەلقێ دو عالەم صاحبێ مەهدەر تويى

يا حەبيب الله شەفاعت نامەيەك داخوازە من
بۆ مە گومراهان د رۆژا مەحشەرێ رەهبەر تويى

غەرق دەرياييێ گوناهم ئەز ژ سەر حەتتا قەدەم
هيڤى و ئومميد بۆ خەلقى سيەه و فەننەر تويى

ڤێ د ناليتن وەداعى هەر د كەت زارى و ئاه
دادخواهێ مە گونەهكاران ل پيش داوەر تويى[1]

---

[1] . ئەڤ هەردو مالكێت ب فارسى ل دويڤ ڤێ هۆزانێ هاتينە:
وداعى هديەئى ناچيزمى ئاوەردە ام چون خود حقير
دارم اميد و توقع از عنايت در پەزير

(٣٥)

میرم کەرەما تە هەر تەمامە
مەعلووم تەمامِ خاص و عامە

خۆش حاکمی ب دان و هممەت
من بعد حکوومەتێ حەرامە

بەختێ مە ل با تە شۆل نە کر قەط
جارەك تە ژ دل نەظەر نە دا مە

قەطعا مە نە دی ل نك تە قەدرەك
هەر چەند[١] تو میر و ئەز گەدامە

دەوران ب مرا نە بوو موافق
ژ دەستێ فەلەکێ شکایەتا مە

د مەدحێ تە مە هندە نەظم و ئنشا
تەحریر کرن مە چەند نامە[٢]

بۆ مەعدەلەت و سەخاوەتا تە
کووتاه[٣] کرن مە هندە خامە

---

(١) .Herchend-i
(٢) .tehrîr-i kirin me chend-i name
(٣) .kûtah-i

ئاخر ژ مرا نه بوو میەسسەر
مەعلوومە ل با تە ما جەرا مە

دانـا تـە کری کـەسێ نە دایە
سێ سالە تەمامـە ئەز پەیامە

هـنـد شۆلِ نهـن ل بـا تـە مـیرم
هەسپەك تە کەرەم بکرا بدا مـە

داعی مە ژ بۆ تـە ئـەز شـەب و روز
یا رەب تو قەبوول بکەی دوعا مە

شـکرێـد مـە بـا تـە بـێ رەواجـن
مەدحێ تە دبێم (علی الدوام)ە

بێ ئاوو روویـن ل با تە بێ قەدر
عللەت چی یە میر چ دی ل با مە

گازندە چرا ژ میـر دکەم ئەز
قاتا د دنێ خـودێ نـە دا مە

رووصارییە خوستن ئەی وەداعی
بـدان وکـەرەمـا خودێ خـوە شامە

((تمت نموده دران روزها که خان محمود توجه بارضروم نزد حافظ شا برد.
اللهم اجعل التوفيق رفيقه واعنه واحفطه. سنه ١٢٥٦ هـ))

(٣٦)[*]

من ژ حەق داخوازە دیٚ حەق یارکار[1] (مەحمود)بی
حەق میەسسەر کەت ژ بوٚ ڤی هەر چیا مەقصود بی

عەسکەریٚ روحانیان دائم د فەروارا تەبیت
دژمنیٚ ڤیٚ دەولەتیٚ رەنجور هەم نابود بی

هەردەما ڤی دی رکیٚبا دەولەتیٚ بوی ......
نەصرەتا کامل ژ بوٚ تە حاضر و مەوجود بی

خاص و عامیٚ عالەمیٚ چاڤنیٚر ئحسانا تەبین
تا ئەبەد با دەولەت و با عەدل و صاحب جود بی

دل ب عەدلا تە خوشن بیٚ حەد فەقیر و بیٚ نەوا
پیٚشِ چاڤیٚ دژمنان قەهرا تە دیٚ مەشهود بی

کەس نهن صادق یەقین وەك میر صاحب حسن ظەن
حافظیٚ ذاتیٚ تە میرم خالقیٚ مەعبود بی

هەر دعاگویی ئەڤیٚ نەسلیٚ مە حەتا ئەز خوٚشم
نامی تە بی من ............... مەحمود بی

---

[*] . ئەڤ هەلبەستە د چاپا بەرلینیٚدا نە هاتییە, ژ بەرکو د ویٚ کوٚپییا ل جەم من دا, نە دهات خواندن, لیٚ پشتی جارەکا دی من لبا نژاد خواندی, هەرچەند خواندنا ویٚ گەلەك ب زەحمەت بوو, لیٚ ئەز شیام ئەڤا هەیی ژ دەسنڤیسیٚ راکەم.

[1] . د دەسنڤیسیٚدا نە خوٚیابوو کا ئەڤ پەیڤە (یارکار)ە یان (یادگار)ە.

گەر ژ حالێ من وەداعی میر بپرسیت جارەکێ
دێ بـەبێژم وەصفِ حالم هەر چیا مەعدود بی

پــڕ وەزیــرێ نــامــدار ئیـروٚکە محتاج تەیین
کەوکەبێ بەختێ تە میرم دائما مەسعود بی

## ٣٧[*]

## هندەك كو كەسێن خەواص و مەعرووف
## مـلـلـەت پــەروەر و مــروڤــێ مـەئلووف

---

[*] . پشتی من دیوانا وداعی دەرێخستی, من ڤیا پێناسینەکێ لسەر کتێبا یووسف و زولەیخایێ و خودانێ وێ سەلیمی بنڤیسم. چەند دەسنڤیسێت کتێبێ کەتن دەستێ من, ئێك ژوان دەسنڤیسا کو سالا ١٩٧١ێ ب دەستێ هێژا مەلا سالەح بارزانی هاتیە مەشقکرن, د دیباجا وێدا, ناڤبرەك (فەسلەك) ب ناڤێ " بەندا ثالث در سبب نظم کتاب" زێدە هاتی یە و د داویا ناڤبرێدا, ناڤێ وەداعی هاتییە, دبێژیت:

**ناچاری وەداعی کر تەمامێ**

**تەحریر مە کر ژ بۆ وێ نامێ**

ل ڤێرێ وەسا خۆیا دبیت, کو ئەڤ ناڤبرا هەنێ وداعی نڤیسییە. ب باوەریا من وداعی, کتێبا یووسف و زولەیخا یا سەلیمی ب مەم و زینا دویێ دانایە, هەرچەندە هەردو چیرۆك د جە و ناڤەرۆك و بیروباوەرادا پیچەکێ ژێك دویرن, لێ ل هندەك لایاڤە ژی گەلەك ژێك نێزیکن, کو هەردو لسەر بنیاتێ ئەڤینێ یێت هاتین ئاڤاکرن, یا دی ژی ئەزمانێ هەردوکا گەلەك نێزیکی هەڤە, یا ژ ڤان ژی گرنگتر هەردو لسەر ئێك هژمارا دەنگا و ئێك عەرووز هاتیە نژنین. ب رەنگەکێ گشتی, سەلیمی چیرۆکا خۆ یووسف و زولەیخایێ لسەر هەلاشەیێ مەم و زینێ ئاڤاکرییە, ژبەر وێ چەندێ ژی گەلەك کەسا ئەڤ چیرۆکە پالدایە ئەحمەدێ خانی. لەورا وداعی ژی چیرۆك خاندییە و ناڤبرەکا وەکی یا مەم و زینێ لسەر کوردا تێدا نە دیتییە, ئێدی وداعی ئەڤ ناڤبرا گرنك, کو هەلسەنگاندنەکە بۆ سەروبەرێ کوردا یێ وی چاخی, نڤیسییە و ناڤێ خۆ ژی ددویماهییێ دا ئینایە.

من دڤێت ڤێژی بێژم, کو ئەڤ ناڤبرە پیچەکێ یا هاتیە دەستڤەدان, هندەك جارا ژ ئەزمانێ وەداعی دویر کەتییە, چەند پەیڤەك تێدا هاتینە خەبتاندن, ئەو د راڤپەیڤا وداعیدا نینن. ئەڤجا هەر چاوا بیت, ئەڤ ناڤبرە (فصل), دەنگڤەدانەکا ئێش و ژانێت کوردایە و بەرپەرەکێ زێرینە د فەلسەفا ملەتینییێ یا کوردان دا.

ددەمێ خۆدا ئا. ژابایی چەند دەسنڤیسێت کوردی ژ کوردستانێ ڤرێکرینە کتێبخانا (سالتیکوڤ شێدرین) ل لێنینگرادێ, دگەل وانا چەند دەسنڤیسێت یووسف و زولەیخا هەبوون. سالا ١٩٨٦ێ م. ب. رۆدێنکۆیێ ئەو دەسنڤیسێت یووسف و زولەیخایێ دەرێخستینە و ل سەر چار لبان تویژاندییە و چاپکرییە.

سالا ٢٠٠٤ێ تەحسین ئبراهیم دۆسکی هەر کتێبا رۆدینکۆیێ و دگەل دەسنڤیسەکا دی یا کو سالا ١٩٨٧ بدەستێ (حسن باتی) هاتیە ڤەنڤیساندن, لسەر ناڤێ خۆ تویژاندییە. براستی تویژاندن گەلەك بێسەروبەر هاتییە و ب لەزوبەز کەتیە بازارێ, لەورا ژی یا تژی کەچی و شاشییە. ب من وەرە ئەگەر هەر لبا رۆدێنکۆیێ دیسا هاتبا چاپکرن, دا تشتەکێ ب بهاتر بیت. ئێدی ل نك رۆدێنکۆیێ ئەو بەندا وداعی نڤیسی نینە, لێ یا تەحسین دۆسکی ئەو بەند هەیە و ناڤێ وداعی ژی تێدا هاتییە.

کردن بە زەمینیٚ خوە سزان بوون
صاحب هونەر و پەهلەوان بوون

هندەك دی هەبوون ب فکر و خووندن
زێدە د جهاندا ئەو ب دەردن

گاڤا ل گورەوێن خوەئیٚ هونەرمەند
مەیزا دکرن کو نینە فەرزەند

سەر پووزیٚ چیان وەکی پولنگان
سەرپووش و بلندن ئەو د جەنگان

لیٚ چبکەم دچن د رێکە ڤاژی
هەر شاشی دبازن نابەسازی

هەردەم بە تەمەڕد و شقاقن
بیٚ ئەولن بهەڤڕا بیٚ تفاقن

لیٚ نینە تو دەرمان بوٚ ڤیٚ ژانیٚ
تەدبیریٚ بکەن د ڤیٚ زەمانیٚ

داخوازا مە تو ب هیڤی گاهی
تەدبیرِ بکەی بە لوطف و کاهی

ئاثار و ئەدەب ژبوونا کوردان
ئاگاهی بکەی کو بێنە پێکدان

داوی هاتە مەردەك قاصدێ وان
پوڕ ژیر و ئەدیب و صادقێ دان

تەکلیفەکێ بلعەجەب بەیان کر
ئلحاحەکێ بێ عەدەد عەیان کر

یەعنی ب مەڕا هەیە موحببەت
ئحسان تو بکە قەوی ب شەفقەت

یووسف ژ مەڕا قەوی سەزایە
تەئلیفِ بکەی قەوی جەزایە

من دیبوو هنەك د شعرِ مەوزوون
ئەز بوومە ژ وان قەوی دل مەحزوون

من راکرن ئەڤ قەدەر بەهانە
ئەڤ شعر و وەزن ژ بۆ چرانە

وی گۆ: ب موحببەتا قەدیمێ
شابەستی ببە ژ بۆ ئەڤینێ

ئنشا تو بکەی ژ بۆ مە باغەك
هێشین ببتن ژ بۆ مە شاخەك

هندی مە کری نەبوویە ئمکان
مـن گـۆتـە دلـێ ب داغ و دەردان

مـن گـۆتـە دلـێ بداغ و دەردە
یوسف ژ ویڕا تـو ژێ خەبەردە

فەرمانـەکـێ بلعەجەب دەرانی
ئـنـشا تو بکەی وەکی دزانی

ئـەی دل تـو دزانـی ئـەز حەزینم
مەعشووق مە نەهن کو ئەز ببینم

ئەلقصصە مە کر ژ بۆ وی ئقرار
ئـەز بوومـە ژ دل قـەوی طـەبکار

ئـەنـدیشە بکە تـو ئەی عـەقلمـەند
باوەر تو بکەی کو ئەی شەکرخەند

نـیـنـن ب مـەڕا کـەمـالـێ ئدراك
قەلبێ مە ببی بۆ وان فـەرەحنـاك

لاکن ئەڤی مامە چار و ناچار
نینن ژ قوماشی ڕا خەریدار

صەد باری تەڤی بکەی جەواهر
صەد نەوعِ ژ توحفەئێ د نادر

بلجوملە بدەی هەمی تەمامی
پوولەك نە کری د ڤی زەمانی

لاکن خوە بخوە دکەم تەصەوور
ئقرار ژ بۆ من بوویە صادر

وەعدا کو مە کر, نەبە موخالف
عەهدا کو مە کر نەبە موصارف

رابوومە ب ڤان دلێ د غەمگین
شایەد بکرا قرار و تەسکین

صووفی وەهە گۆتە من موعەمما
پورسا مە کر و ب رەسم و ئیما

یەعنی ژ مەڕا تو یوسفێ خووب
تەصنیفِ بکەی ب رەسم و ئسلووب

مـن گـوٚ: قـەدەما تەبی موبارەك
صەد جارِ قەسەم دكەم بجارەك

نینن ژ مەڕا چو تاب و طاقەت
ئنشاءِ بكـەم ژ بـوٚ تـە ئولفەت

ئەی دل تو وەرە بچینە سازیٚ
بـەیـعـەك وەهەیە د بن تەرازیٚ

من گوٚت وی تو دوٚستەكیٚ تـەمیزی
ئـیـروٚ ژ مـەڕا قـەوی عـەزیـزی

رووحیٚ خوە ژ دوٚستِان فداكر
لەو دوٚست ژ دوژمنان جوداكر

ئبرامە تە كر ب من جەفا بوو
ئاخر كو ژ یاریٚ ئو فەنا بوو

رەددا مە كری نەبوو موغەییەر
بـاری بگرە ژ مەڕا مویەسسەر

نـاچـاری وەداعِ كـر تـەمـامیٚ
تەحریر مە كر ژ بوٚ ویٚ نامیٚ

(۱)

ای آنکـه جـمـال تـو بـهـر ذرهء پیدا
یك پرتو از آن حسن بینداز تو بـرمـا

می سوختم از درد و غم و دوری هـرگاه
از بـس کـه جـمـال تـو خـالیست ز هرجا

آن دوست, بنزدیك و من بیخبر از وی
تـا چند بگردیم چنین, بی دل و شیدا

جز عشق که در هردو جهان جلوه گری نیست
دل نـیـسـت کـه آزاد بـود زیـن غـم و سـودا

ای عشق توی جام جهان جلوه نمایی
در خـلـوت تـاریـك دلـم پـارهء بنما

ساقی ز کرم خیز تو یك جرعه‌ی می ریز
بـر عـاشـق دل سـوخـتـه زان جام مصفا

تا یابم از آن بیمام ز خودبین خلاصی
در چـشـم وداعـی نبـود جز حق یکتا

(۲)

مـی خـرامـی بـه تـکبّـر زره عجب و تمنا
زجان صد بی دل چون مـن بـفدای تو فدا

چند آیم بسوی گلشن جانا چه شود
یـکـره از بهـر خدا قـامـت رعنا بنما

بـاغبان فرش رهت کرد سمن سوسن گل
حـیـف مـی باشد بر روی زمین آن کف پا

جای تو گوشهء چشم است و صنوبر لـب جو
ای عـجـب چـند تـفـاوت تـو کـجـا سـرو کجا

نـه بـرای دل مـن بـهـر خـدارا تـو بـبـر
سوی آن مه برسان قصّه ام ای پیك صبا

بـلـبـل دل بـهـوای گـل رویت نالد
تو مدان ناله و فریاد من از بادهوا

میکند با تو وداعی هوسی گشت ولی
نـکـنـد سـرو روان هـمـرهـی شـاخ گیا

(۳)

## مخمس وداعی بر غزل جامی

مرا ای باغبان امروز ره ده جانب گلها
که داغ گلرخی دارم عجب شیرین شمائلها
دو چشم خون فشان من کنارم کرده ساحلها
نسیم الصبح زرمنّی ربی بخد و قبّلها
که بوی دوست می آید ازین پاکیزه منزلها

ز درد فرقت جانان غمی دارم ز حد بیرون
چنان مشتاق مهجورم دلی دارم ز غم پر خون
شهید عشق تو چون من هزارانند هلك افزون
چو گردد توق وصل افزون چه جای طعن اگر مجنون
به بوی هودج لیلی فتد دنبال محملها

چ باشد گر تو ای مهوش مرا روزی شوی مهمان
فدای قد موزون تو سازم هم دل و هم جان
بیك جرعه چه کم آید ز موج قلزم احسان
دل من پر ز مهریار و او فارغ نبود است آن
که میگویند راه هست دلهارا سوی دلها

غمت پخته مرا ای جان تو گویی بوده ام بریان
خدارا ای فلك روزی مرا مهمان او گردان
مرا از تو کند زنده بیك جرعه می رخشان
رسید اینك زره سلمی و من از ضعف تن زینسان
فخذ یا صاح روحی تحفة منی فأقبلها

مـرا ای کـاشـکـی یـارم بخواندی نزد درگاهــش
ز چشم خون فشان من شدی یك لحظه آگاهــش
بـود یـا رب من بیدل شوم درپیش دلخواهــش
مـریـز ای ابـر دیده آب حسـرت بر سر راهــش
کـه دور اولـی سـم اسبـش ز آسیـب چنین گلها

کجا از دل شود زائل غمت ای مهوش چون گــل
غلط گفتم اگر روزی وصالت می شود حاصـل
خـس و خــار فـراق تـو بـود از دل فـتـد زائــل
مـرا از هجر او در دل گـره مـی بود صد مشکل
چو دیدم شکل او فی الحال حل شد جمله مشکلها

تو آن حسنی که می داری گل و سنبل کجـا دارد
فـلـك در امـر و فـرمـانت ز تـو چشم وفـــا دارد
ز درد دوری جــانــان وداعــی صـد جـفــــادارد
ز جـور دور غـم فـرجـام جـامـی قصه هـا دارد
ولــکــن خــوف امــلال الـنـدامــی لـم یـطـولـهـا

(٤)

جمله اسباب جمال آن رخ زیبای ترا
همـه بـر وجـه کمالست و مهیای ترا

چشمهء خضر یقین دید و مراد دل یـافت
یك زلال هـر کـه بـنـوشـیـد ز لبهای ترا

سرو شمشاد و صنوبر همه گشتند خجل
پـیـش آن قـدّ سـهـی قـامـت بـالای تـرا

لالـه بـر صـفـحـهء رو داغ غـلامـی بنهاد
اندران لحظه که دید آن رخ حمرای تو

نـیـسـت در باغ نهالی که بود نخل مراد
همچو آن قامت گلدسته دل ئارای ترا

چشم نرگس نکند دعوی مستی و خمار
پـیـش بـادام سـیـه آهـوی شـهـلای ترا

گر براه تو وداعی بدهد جان چه عجب
کیست در شهـر دل آزاد ز غمهـای تـرا

(۵)

یا رب انصاف بده آن ماه مه‌تابان ما
تا که رحمی آورد بر سینه‌ی بریان ما

لجهٔ خونست کردم یا نه کرد آب مهیب
بس که می ریزم سرشك از دیدهٔ گریان ما

یك نگاه از چشم او مانند سحر سامری
جمله عالم خون فشانند آنکه درد و ژان ما

سوختم از فرق تا پا ز آتش دوری وی
از فلك بگذشت جانا هر شبی افغان ما

بار هجران تو کوهی بود بر تن اوفتاد
طاقت کوهی چنان تا کی بود این جان ما

بی تو آهم از حریم سدره هر شب میگذشت
هیچ ای مه بشنوی آه دل سوزان ما

بی تو خواهم صبر کردن بارها کردم قسم
زود آخر باز گشتم می شکست پیمان ما

**خسته ام در کنج دوری تشنه   لعل لبت**
**گر چه ای رو مه دریغم داشتی درمان ما**

**ناله‌ی زاری وداعی یا نوای بلبل است**
**می سراید هردم از شوق گل خندان ما**

(٦)

کی بود یا رب که بینم باز دیدار حبیب
کس مبادا در جهان چون من گرفتار رقیب

ما دعا گفتیم زمانی او مرا دشنام داد
مانده ام اندر تحیر من ازین سرّی عجیب

تا توانی سعی خود در صورت ضایع مکن
تا بیابی از علوم معنوی خودرا نصیب

دست بر نبضم نهاده بس حکیم آزمای
از تحیر گریه غالب گشت بر مسکین طبیب

هر دلی کو جای عشقست ومجو ازوی خرد
جای در گوشش نگیرد گفتن و پند ادیب

گر چ بس هجران کشیدم باشدم امیدوار
یکزمان روزی شود دیدار جانان عنقریب

گر برآری برزبان نامی وداعی چون شود
این قدر بر گو چه مقصودی تو داری ای غریب

(۷)

دوش برهم نزدم دیده‌ی خودرا همه شب
بلکه آن مونس جان آید و بگشاید لب

همچو خورشید برآید ز در آمد دیدم
عزم او کشتن ما بود چه شوخ بغضب

بکرشمه بمن اند اخت دوسه ناوك و تیغ
گفتمش چیست گناهم چه خطایی چه سبب

گفت خرموره و لؤلؤ همه پیش تو یکند
پادشاهیست هر آن کەس که بود صبر و ادب

گنج صبر است و قناعت سر ایشان ادب است
سخن اینست که گویم گنج قارون مطلب

من ازان بشسیتم دگر دست امید
مرهم ریش درون داد شفا یافت عجب

ای وداعی تو از وگر چه درد و چه دوا
داروی تلخ دهد سود صبر به ز عنب

**(۸)**

**خوشا آنکس که بیند جای خوشاب**
**خصوصا قلعهٔ زیبای خوشاب**

**مقام شادی و جای مفرّح**
**که بینم در جهان یکتای خوشاب**

**ز برج سرخ وز أیوان مینا**
**گرفته کار خود بالای خوشاب**

**عجب فیروزه و موزون رنگین**
**شدم حیران من از سودای خوشاب**

**مقامی پر سرور و وضع و گلشن**
**چه خوش افتاده در صحرای خوشاب**

**نباشد آب روی هفت اقلیم**
**بغیر از قلعهٔ رعنای خوشاب**

**اگر گرد جهان یکسر بگردم**
**نبینم موضع همتای خوشاب**

**کنون در دست یك ظالم فتاده**
**فتاده آتشی درپای خوشاب**

**خـداونـدا ازان ظـالـم رهـاکـن**
**بسی افتاده در غوغای خوشاب**

**تو گویی تخت اسکندر بود این**
**که دارد نسبت دارای خوشاب**

**تو گویی باغ او خلد برین است**
**زهـی بـاغ ارم آسـای خـوشـاب**

**هـمـه عـالـم ز دسـت او بـنـاشـد**
**شد سنه ١٣٤ در مأوای خوشاب**

**تـو گـویـی نـهـر او آب حـیاتـست**
**که معلومست خود معنای خوشاب**

**مراد و قبله‌ی جان من آنجـاست**
**بـسـان بلبلم شیدای خوشاب**

**چو غنچه خون دل خوردم زمانی**
**پـی آن لـؤلـؤ لالای خـوشـاب**

**خـریـداری نـمـی بینم ببـازار**
**شناسد قیمت کالای خوشاب**

